نەژاد عزیز سورمێ

# گەمە شاراوەکانی با

**چەند ترپەیەک لە**
**هەرێمە هەڵایساوەکانی**
**شیعرەوە**

**وەرگێڕانی**
**نەجات حەمید ئەحمەد**
**پێداچوونەوەی: نووسەر**

کوردستان– **2007**



* گەمە شاراوەکانی با
چەند ترپەیەک لە هەرێمە هەڵایساوەکانی شیعرەوە
* نەژاد عزیز سورمێ
* وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: نەجات حەمید ئەحمەد
* پێداچوونەوەی: نووسەر
* نەخشەسازی: شکار نەقشبەندی
* مۆنتیڤەکانی ناوەوە: هونەرمەند فوئاد عەلی– ئیتاڵیا
* خەتی بەرگ: هونەرمەند محەمەد زادە
* تاپێست: سامان زاهیر
* چاپخانەی: خانی– دهۆک
* چاپی یەکەم – کوردستان – 2007

Ê«ñ}Ö–...Ë ËdF0ý

## پێشەکییەکی پێویست

لە سەرەتاوە کە بیرم لەوەرگێڕانی ئەو شیعرانەی شاعیر نەژاد عزیز سورمێ کردەوە، هەندێک دوو دڵ بووم، ئەمە لەبەر ئەوەبوو نەمن و نەشاعیر لەو باوەڕەدا نەبووین کە وەرگێڕانیان دەشێ قاڵبێکی یابنیاتێکی زمانەوانیی شیعریی جوانیان لێ دەرچێت، چونکە شاعیر هەر خۆشی لە پێشەکیی عەرەبییەکەیدا بەتەواوەتی ناوی نووسینی شیعریی بێ نەبەخشیون بەڵام پاش ئەوەی دەستم بەوەرگێڕانیان کردوو ڕۆژانە چەند پارچە شیعرێکی وەرگێڕدراوم بۆ شاعیر دەگەڕاندەوەو شاعیر کاتێکی زۆر بەپێداچوونەوەی شیعرە وەرگێڕدراوەکان خەریک دەبوو، لە گۆڕینی وشەکان و شوێن پێکردنی سەر لەنوێی ڕستەکان و دۆزینەوەی هەندێ وشەی نوێ کە زۆرکەم بەکارهێنراون لە نووسینی شیعرداو شاعیر بەزمانێکی شیعریی جوان دایانی دەڕشتەوە بەڕاستی شتێکی جیاوازی لێ دەرچوو و ئەو دوو دڵییەی لەلاماندا هەبوو ڕەواندیەوەو بۆم دەرکەوت خوێندنەوەی ئەو شیعرانە لە دەقە کوردیەکانیاندا زۆر زۆر جوانتر دەرچوون لە خوێندنەوەیان لەدەقە عەرەبییەکەیاندا، ئەمە سیحری زمانە کە دەتوانێ بەرگی نوێ بەهەموو دەقێکی هونەری ببەخشێ کە بێگومان ئەم کارەش ماندووبوونێکی زۆری دەوێ جگەلەوەی کاتێکی زۆریشی دەوێ، بەڵام شاعیر ئەم ماندووبوون و ئەم کاتەشی لە پێناوی دەقەکاندا ڕێکخست کەمن سوپاسی دەکەم جگە لەمانەش وەرگێڕان ئەگەر چی زانستە بەڵام لە هەمانکاتدا سیفەتێکی سۆزاویی هەیە، پەیوەست بە زمانەوە، من گەیشتمە ئەو باوەڕەی کە هەندێک ووردەکاری و پێداچوونەوە بۆ دەقی وەرگێڕدراو بکرێ لەلایەنە هونەری و جوانکاری و زمانەوانیەوە دەقەکە ئەوەندە کاملترو جوانتردەبێ، چونکە دەقی شیعری ناتوانێ هەموو ڕستەو هەموو وشەیەکی هەڵبژێردراو بگرێتە خۆی تەنها ئەو وشەو رستانە نەبێت، کە تواناو هێزێکی جوانکاریی شیعریان تێدایە، بۆ ئاگاداریی خوێنەرانیش ئەگەر بێتوو شاعیر خۆی بەوەرگێڕانەکەدا نەچووبووایەوە لەو باوەڕەدا نەبووم

ئەو دەقانە بیان توانیایە بەوشێوەیە دەربکەون، لێرەدا گرنگە شتێک لە بارەی ناوەڕۆکی شیعرەکان بڵێین، من لە خوێندنەوەی ئەو شیعرانەدا هەست بەدڵ تەنگی و خەمێکی زۆر دەکەم، چونکە دەچمە ئەو جیهانە غەمگینەی شاعیرەوە، هەمووی هەناسەو ئازارە بۆ ئەو لەنگیە نەشیاوانەی کەمرۆڤ دەکەوێن و لە مرۆڤایەتیی دەخەن و هەموو بەهاجوانەکانی بەمرۆڤ بوونی لەدەست دەکەنەوە بەڵام جیهانی ئەو پێچەوانەیە لەگەڵ ئەو جیهانە.. داخی شاعیر بۆ ئەو هێزە نابینایانەی کە مرۆڤ لە ئاکارو ڕەوشتی جوانی خۆی دەخەن، بۆ ئەو ساتانەی کە مرۆڤ تەنها ئەوەندەی لەدەست دێ بڕوانێتە بەرامبەرە کەوتوەکان، بەرامبەرە دەست بەخوێنەکان، بەرامبەرە جەستە فرۆشەکان و بیر لەوە بکاتەوە کە ئێمەی مرۆڤ چۆن بتوانین نەهێڵێن جوانیەکانی خودی مرۆڤ هەتاهەتایە بکەون و خاوەنیان نەبێت تەنیایی شاعیر خەمگینی خوێندنەوەو وردبوونەوەیەکی قووڵمان لەلادا دروست دەکات، من باس لە ناوەڕۆکە بەرجەستە کراوەکان ناکەم، باس لە گەشتە سەختەکانی مانا ناکەم، بەڵکو من لەپاش خوێندنەوەیەک بیرلەوە دەکەمەوە لەو خوێندنەوەیەدا چیم لەلادا دروست دەبێ، هەموو ئەو ڕستانەی شاعیر کە باس لەسەرکەوتن و ئاوابوونی



خۆشەویستی و بەها مرۆڤایەتییەکان دەکات نەیان توانی ئەو خەمگینیە لەدڵم دەرکەن کەواتە شاعیر لەکوێی ئەو شیعرانەدا بدۆزینەوەو لەکوێدا لێی بگەڕێین؟ ئەو جیهانەی لەم شیعرانەدا بەرجەستە کراوە جیهانێکە خۆشەویستی تیایدا لەبەرگی سادەو پڕە لە درەوشانەوەو پڕلە ڕووناک بوونەوەی دەروون کە هیچ هێزێک ناتوانێ دەستەمۆی کات یاخود لەکەداری بکات، چونکە خۆشەویستی لەو جیهانەدا وەکو تەلیسمێکی دەست بۆ نەبراو وایە، شەوانی ئاڵ و واڵاو مل دان بۆ گرفتاریی لەزەتەکانی دنیاو ئاڵ و گۆڕی دەست و دەست پێکراوو کەوتن لەنێو بۆنی پیسی بەرژەوەندیەکان و خۆخزاندنە ئەو گۆشانەی گەڕانەوەیان بۆ نییە.. ئەمانە لەناخەوە وا لەشاعیر بکەن وەکو بڵێی لە زەمەنێکدا نەژی، یاخود دان بەزەمەنێکدانەنێ کە خۆشەویستی تێدا لەبار دەبرێ و بەکۆتاییەکی تراژیدی دەڕازێندرێتەوە، ئەمەیە ئەوشوێنەی شاعیر تیایدا دەژی و بیردەکاتەوە، ئەو لەشوێنێکدایە ساتەکان بێگەردو خاوێن، پەیوەستەکانی نێوان مرۆڤ ڕووناک و ڕاشکاوو لەڕوون، مرۆڤ بەهەموو ئەو توانایەی کە هەیەتی دەتوانێ جیهانێک بۆ خۆی بنیات بنێت کە خۆشەویستی و ڕاستگۆیی و خاوێنیی بیری تێدا ساتە تراژیدیەکان خامۆش دەکەنەوەو هیوایەکی

دیکە بەژیان دەبەخــشنەوە ئەمــەیە زۆر بەکــورتی بنیـاتەکـانی مـانا لای شاعـیـر کە شیـعـرەکـانی پێ نووسـیـوەتەوە، بەهەرحـاڵ من لەکـوردیەکـەیدا چێـژی زیاترم وەرگرت وەکو لە دەقە عەرەبییەکەیدا ئەمەش شتێکی سەیرە، چونکە هەموو شیعرێکی وەرگێڕدراو بەشێکی گەورە لە توانای ماناو زمانەوانیی خۆی لە دەست دەدات، بەڵام دەتوانم بڵـێم ئەم شــیــعــرانە توانای زمانەوانیان تۆکمەکرد پڕمانا ترو جوانکارترن لە عـەرەبیـەکـەی، ئەمـەش تەنهـا بۆ چوونەو دەشێ قسەی دیکەی لەبارەوە بکرێ.

**نەجات حەمید ئەحمەد**

**تەمموزی 2007**

**تێبینی:**

**کاک نەژاد ئەم دەقانەی لە ئەسڵدا هەندێکیان لە (خەبات)ی ساڵی 1995دا کە ئەوسا بە عـەرەبی دەردەچوو؛ ئەوانی دیکەیشی وەکـو گۆشەیەک لە گۆڤاری (الصوت الاخر)دا لە نێوان ساڵانی 2004 - 2005 لە ژێر ناوی (شرفە)دا بڵاوکردۆتەوە کە لە دوایدا بەکتێبیش هەمان ساڵ، هەر بەو ناوە بڵاوکرایەوە.**

**دیارە کـاک نەژاد دڵی نەهاتووە ناوی شـیـعـریان لێ بنێ، بۆیە وەک (چەند ترپەیەک لە هەرێمە هەڵایساوەکانی شیعر) دەیانبینێ، کە لە پێشەکیە عەرەبیەکەیشدا ئاماژەی بەم لایەنە کردووە.**

**وەرگێر**





**چەند ترپەیەک لە**

**هەرێمە هەڵایساوەکانی**

**شیعرەوە**

**(1)**

دەستنیشانکردن
قورسترین هەڵبژاردن
بە نێو گەردەلوولدا تێپەڕین
یا نائومێدی؟
بڵێی هیوایەک لە گۆرانیەکەماندا هەبێ؟
من لەو گۆشەیەوە قسەت لەگەڵ دەکەم!





سەرفرازی خەریکە ون دەبێ..
ئێوارەیش
لەو یادگاریانە بەدەر بە خۆشەویستی کۆت کراون،
چیدی تێدا نییە..
هاوڕێم ئەو پەنجەرانە سوودیان چییە؟
گەر بەڕووی ئازادیدا نەکرابنەوە..
ئەوەتا من لە یەک کاتدا بە تیشک و شمشێر گەیشتم..
**2005/12/11**



**(2)**

خاتوون خەریک بوو گەردەلوولی بە دەمی لاڵەوە
هەڵدەواسی..
ئەویش سەرەتای ئاسۆی بەخۆوە گرتبوو..
ئەمە قەدەری مێژووە
لە جوگرافیا تارماییەکەیدا
کەواتە ڕەگەکان بۆ کێن؟
مەرگ...

دەنگ...
ئینجا شکستی قەقنەس،
بەسەر باڵی ئاسۆوە..
دەماری بە ئاگای فرمێسکاوی
لەو چاوانەدا دەبریسکێنەوە
کە بە دوویاندا گەڕایی و نەتدۆزیەوە..
بۆ برای من؟
باڵی شکاو بەم چەشنە هەڵنابەسترێتەوە
خەونیش وەها نییە
خەون بەو جۆرەنییە.. براله!

**1995/6/29**



**(3)**

ژێیەک دەژەندرێ و
ژێیەکیش دەژەنێ ... دوو شتی جیاوازن
بۆچی دنیای بینینمان
بوون بە باڵۆنی ڕەنگاو ڕەنگ و
بێهوودە دەفڕن..؟
بۆچی سرووتەکانمان بوونە هاواری بیابانان؟!

دەبا ئەم وێستگەیە ببێتە
دوا شەو و
دوا هەناسە..
لە هەناسەبڕکێماندا بە دوای سەراب..
با پێکەوە هەناسەیەک بدەین هاوڕێم
سەراب تەواو شەکەتی کردووین..

**1995/5/25**



**(4)**

نهێنی بێدەنگی هەر دەدرکێنم
بێدار، (جاران ئاسا) دەمێنمەوە،
تا ئومێددز
بە ئابڕووچوویی،
بە کۆتی شکست و شەرمەوە دەردەخەم.
مێژووتان تا دوا تاو خواردەوە..

میوەکانتان بە کاڕکی ڕنی و
بە تەواوی پەناتان بۆ ساختەچیەتی برد...
بەم جۆرەو زۆر بە ئاسانی
ویستتان گیانمان لەسەر لەپی دێو دابنێین
بەم جۆرەو زۆر بە ئاسانی،
لەوپەڕی تەوژمیاندا
دەستمان خستە ملی شەپۆلەکانەوە
لێ کەللەپووچەکان





که تژی ڕق و کینه بوون
فێری ئەوە دەبن سرەوتن نەناسن
کەللەپووچەکان پڕن لە بەتاڵی
خۆیان لەسەر تیرۆرکردنی ڕێگادا ڕادێنن
بەڵام کەش وهەوای هەڵدێر بێگومان بەڕێوەیە
وەهمیش وەک خۆی دەمێنێتەوە
من و تۆش نهێنی بێدەنگیمان دەدرکێنین و
هیوادزەکان بە ئابڕوچوویی،
بە کۆتی دوا شکستیانەوە ئاشکرا دەکەین..

**1995/7/14**



**(5)**

لەوانەیە بە یەک بگەین
ئینجا تۆ بڵێی ژوان سەرمەستیی تێدابێ؟
بێ ئەوەی زەمەن ببینین کە بەسەر دەچێ؟!
جەستەی تۆ تادێ دەبنیسێ
ئەوەتا هی منیش لە ژێر قورسایی وێکهاتنەوەدا
دەناڵێنێ..

لە كاتێكدا دەریایەک تاریكستان بەشت ناكا
تا لە گومان نزیک بیتەوە
من تاڵێک ڕووناکیم بەسە
دڵنیایی بگرمە دەست...
تۆمنت بەدەر لە خودی خۆم دەوێ
تۆ زەمەن نابینی
كەواتە بۆچی بادانەوە؟
بەرەو ئەو ئاسۆیە لێچووەوەدا؟
بەرەو ئارەزوویەک بە ڕەنگی سەراب....
لەوێدا كە بە یەک گەیشتنی تێدا
دەبێتە جۆرێک لە مەحاڵ؟!

**1995/8/1**



**(6)**

ئەوەتانێ بە دوای شەپۆلەکانەوەم
لە پشت ئاهەنگی شەوە درێژدارەکانمەوە
خامۆشی خۆی پێمدا دەکێشی
بە بێدەنگی.. تێتانەوە ڕادەمێنم
بەڵام چیتر حەز بە دۆستایەتیان ناکەم
ئێوە ڕێگەو هیواتان پێکەوە دزی..

به خۆو بەماسکە پەڕپووتەکانتانەوە
بەرەو نەبوون چوون
بە هیوای هیچ..
بەزەییم پێدانا دێتەوە، لە کاتێکدا بە بێدەنگی
لە پشت ئاهەنگی شەوە درێژدادڕەکانمەوە
تێتانەوە ڕادەمێنم..
چیتر حەز بە دۆستایەتیتان ناکەم
شەوانێکە کەسێکم هەیە دەبێتە هاوەڵم
ئیتر ئەم ئێوارە و هەموو ئێوارەیەک



هاونیشینی خۆم دۆزیەوەتەوە...
ئەوە «حەمەد»ـە
ئەرێ بەڕاست ئێوە حەمەد دەناسن؟
ئەو پاسەوانە پاک و دڵ خاوێنە
کە هەندێکیان وای سەیر دەکەن
هیچ لە دنیادا نازانێ
لەگەڵ ئەوەشدا
هەموو ڕۆژێ
بە دەنگە گەورە ئاساییەکەی لێم دەپرسێ:
ئەرێ نەژاد چی تازە دەربارەی بۆسنیاو هەرزەگۆڤین
هەیە؟






ئەوە حەمەدە
لە جیهانەکەیدا وا فێربووە
تەنیا خۆشەویستی و وەفاداری بزانێ..
فێری منیشی کردووە بەزەبیم بە خۆتان و بە ورگتان و
بە پێکە زەلیلەکانتاندا بێتەوە..
کە لاتان بووە بەهۆ و ئامانج..

لە پشـــتـــــەوەی ئاهەنگی شـــەوی درێژدادڕمـــــەوە
دەدرەوشێمەوەو
بەو ستراتیژیەتەشەوە
هەوڵ دەدەم لە دەست خۆتان ڕزگارتان بکەم
**1995/8/22**

(7)

له شه‌ڕێکه‌وه بۆ شه‌ڕێکی دی
له جه‌نگێکه‌وه بۆ یه‌کی دی
سڕبه‌کان چیان ده‌سکه‌وت؟
له پشته‌وه‌ی بۆشاییه‌کانی سه‌ده‌وه دزه‌یان کرد
وه‌ک زبڵ و زاڵ به‌سه‌ر پایته‌ختی
ئارام و برسی و
چاو له نادیار که‌ڵه‌که‌بوون..



سڕبه‌کان هاتن
ئاینده بدزن
کاره‌سات بگه‌ڕێننه‌وه..
ئه‌وان ته‌نانه‌ت سیمای ده‌م و چاویشیان دزی
بیکه‌ن به ماسکی دیکه بۆ خۆیان..
هاتن له خودی سه‌ره‌ڕۆیی تێپه‌ڕێن.
به‌ڵام سڕب چیان ده‌سکه‌وت؟
به ماسکی ساخته و

دەمامکە هەمەچەشنەکانیان..؟
ڕێگا گیراوەتەبەر
ئاوازیش بە ژێی ئومێد بەردەوامە..
پێم ناڵێی سڕب چیان دەسکەوت؟

**2005/9/16**



**(8)**

ئێشی ڕۆژگار! وریابەوە!
وریابەوە! ڕۆح پیر نابێ..
ئێستا چۆلەکە وای لێ هاتووە لێم دەگاو لێم ناگا..
نیشتیمان بە شێوازی سڕبەکانەوە کوژراوەتەوە
چ هوودەیەک لەوەدا هەیە ڕەشەبا بەرە و بەهشتمان ببا
وریابەوە!
هاتووە داڵانەکانی ناخی ڕۆحم ببڕێ
هاتووە برینەکانم بکولێنێتەوە

که له خۆیدا به چەقۆی ڕۆژگاری نامەرد کولاونەتەوە
ڕۆژگاری سڕب و
بازرگانانی تلیاک و
ئومێد دزان..
وریابەوە!
تا خەونەکانم بگرمە دەست
بۆمان نووسراوە بە بێدەنگی هاوار کەین
ئەی ئەو دوورگەی



به ماتەمینی زماوەندان گەرم بووە..
بێدەنگی تەنیا بێدەنگی..
دەبا هاوارکەین تا پڕ دەبین لە بێدەنگی
با هاوار کەین ئەی ئازاری ڕۆژگاران!
ئێستا چۆلەکە وای لێهاتووە
لێم تێدەگاو لێم تێناگا...

**2005/10/12**

**(9)**

(ماموٚستا) به پەنجەی ئاماژان دەکا
بەڵام بە چی و بۆچی؟
ئەو ناو وناتۆران بۆ خەڵکی دادەنێ و
بە سەخاوەت  دەیانبەخشێتەوە
دارا دوو داری دی



بەڵام «ماموٚستا» تەنیا دارێکیشی نەبینی
(راشید) کاتی خۆی لە کتێباندا تۆی دەچاند
لەواقیعیشدا لە هەندەرانی دەهێنا
ماموٚستاش دەستی ڕادەوەشێنێ
بێ ئەوەی ئاسۆیەکی لەبەرچاو بێ یا هەبێ..
با (ماموٚستا) دەست ڕاوەشێنێ
ئەوەی «لە مــەودایاندا نەخــوێنێــتــەوە.. دوورتریش ناخوێنێتەوە»

**1995/11/6**

## (10)

گوڵە زونبوقەیەکت هەبێ
کۆڵیتێک و جلوبەرگی پینەکراو
پێکێکی پلە دەو
دیمەنی تراژیکۆمێدی
ئازادیەکیش لە چەشنی ئازادی سەربازیی و
بێی کۆچ بکەی
عەبدولڕەحمان



هاورێیم
ئەمە ئینساف نییە..!!
- بەڵام چی لە حەوت زگ و
دایکیان بکەم
کەس لە من زیاتر لە خواحافیزی نەدەترسا
بەڵام مانەوەش جۆرێک بوو لە شێتی
- چیی پێ بڵێم؟
لە کاتێکدا هەزار پرسیار



لە دەریایی وەڵامە تیزماڵ بووەکان
لە نێو پەنجەکانمدا پەرش دەبن
چی پێ بڵێم؟
ئەمە خودی کەناری ڕۆژگارە
لە جوگرافیای نەفرەتلێکراوو
مێژووی بە دەمامک داپۆشراودا
دەدرەشێتەوە..

**1995/11/23**

**(11)**

بۆچی؟ بۆچی؟ بۆچی؟ بۆچی؟
بۆچی؟ بۆچی؟ بۆچی؟
بۆچی؟ بۆچی؟
بۆچی؟
وەک دەبینی
ئەم سەدەیە، سەدەی «بۆچی» و «لەبەرچی»یە
کە لە هەر یەکێکیاندا



قدیسێک یا شەیتانێک هێللانەی لێ چێ کردووە
ڕۆژگار ڕۆیی و
ئێمەش بێدەنگ لەگەڵێدا ڕۆیشتین
«بۆچی» ؟!
تەنها ئەوەمان بە دەستەوەماوە بیلێیینەوە
ئەوەندەش لە دەست مندایە بینووسم

ڕەنگە بۆ ئەوەی ئەم کونجەی پێ هەڵایسێنم.
یا وا دەر بکەوێ.. خامۆش بووە..
کێ دەزانێ؟
سڵاو لە سواڵکەرو
سڵاو لەبەرپرس و
لە سەدەی زێڕینمان..
سەدەی «لەبەرچی» و «بۆچی»....

**1995/12/4**



## (12)

ساڵی ڕۆژێک باس لە مافی مرۆڤ دەکەن
تا ڕۆژەکانی تر پێشێلی بکەن
بەم شێوەیە و بەو چەشنە
مافی مرۆڤ
بوونەوەری ئەفسانەیی و
درۆی گەورەی .. دنیا






هاتە ناو
سەردەمی سێرک..
کە خەمی تێدا دەبێتە
بزەی ساردو مردوو..
ئەوە بە خودای چرپە چرپی
بە ڕۆژی نیوەڕۆیە
دەربارەی – حەفت و هەشتی هێلکەو مریشک
کامیان لە کامیانن
خودایە!
ئەم هەموو دەمامکە لە کوێوە دێن؟

**1995/12/9**

## (13)

ئەی **1995** لە بیرت ناکەم
هەمیشە یادت دەکەمەوە
تۆ بوویتە نیشانەو وەرچەرخان
بۆ سەرەتای ڕۆژگارێک
بێ ڕەنگ و بۆن..
لە تۆدا ئاگری شەڕی چەپەڵیان
لە نیشتمانە بریندارەکەمدا گەیاندە ئەوپەڕی
هەر لە تۆداماڵیان داگیرکردم و بە تاڵانیان بردوو
دڵی زیندوویان



دایک و
کتێبخانەکەمیان دزی
کە دنیام پێ دەدیتن  و دەبیست
کە هەناسەم پێ دەدان..
کە هەر ئەوەندەشم
لە ماڵ و مڵکی دنیا شک دەبرد
ئەوانیشیان دزی..
چۆن لە بیرت دەکەم؟

ئەی ئەو ساڵەی لە ڕەنگی مێژوویان دەچیت
ئەی ساڵی هەزار دەمامک و دەمامک
کە قەت ڕۆژێ نەبووە بەبێ تاوان خۆرت لێ هەڵبێ
هەمووشی دەرحەق بەبەرائەت..
بەرائەت و تەنیا بەرائەت و هیچیتر...
ئەی ئەوساڵەی تێیدا
چووینە ناو ڕۆژگاری سووکایەتی پێککردن و
خۆکوژی و
بە تاڵانبردنی خود..
ڕۆژگاری (بژی و ئازار بچێژە و قسە مەکە!)
چۆن دەتوانم لە بیرت کەم...

**1996/1/3**



## (14)

کە پێکگەیشتن
وەخت بە سەرچوو بوو..
شتە جوانەکانیش
لە ئێوارەی تەمەنیاندا بوون..
تۆش بە هەنگاوی لەرزۆکەوە
بەرەو پەنجەرە تەنیاکە دەچووی
کە هێشتا لە بەرابەرمدا مابووەوەو
تەنها ئەوم شک دەبرد..

کاتێ پێکگەیشتین
شتێک نەبوو ترسمان بڕەوێنێتەوە.
نە خۆر، نە مانگ، نە ئەستێرە..
ترسی سالآنی تاڵ
لە ئومێدی وێڵی نەبێ لە گۆرانیەک
یاخود لە گەردەلوولێکدا..
ئەسەف
تا ئەم ساتەش
نە گورانیەک
نە گەردەلوولێک..
نە ....... مان نەدی..

1996/1/18



## (15)

سڵاو لە پەنجەرەی خەم
ئەگەر شادی لای ئێمە کەڕ بێ، بێ پەنجەرە..
سڵاو لە گوڵەکانی پایزو
شەپۆلی فرمێسکان
ئەگەر بەهارو
زەردەخەنە و پێکەنین
تەنیا لە بۆڕسە ڕەشەکانەوە بێت..

ئەی خودا
ئەی تاک و تەفروتوناکەرو تەنیا
چیمان کردووە؟
تاکو بمانخەیتە بەردەم ئەم سوپا زەبەللاحەی
کەللە بەتاڵانە لە هەموو شتێک
لە تێکدان نەبێ..
تێکدان و بەس..

سڵاو لە خۆرئاوا.. لە دڵنیایی
شتێک نیە درەوشاوەبێ
ئاسۆیەکی خامۆش نەبێ..





لەسەرابی بۆڕسە و قاچاخچیان..
ئەوە سرووتەکانمانن
کە بە بەرچاوو گوێماندا لە کەنارەکانی ون بووندا
خلۆر دەبنەوە
کەواتە
سلاو لە پەنجەرەکانی خەم و
لە گوڵەکانی پایزو
لە شەپۆلی فرمێسکان
وەک ڕێوڕەسم و هاودەنگ ..
وەکو نوور..

**1996/2/3**



**(16)**

بەتەنیا هێڵێکە..
با لە کوژانەوەی بپارێزین!
کەنار بەردبارانمان دەکات..
دەستلێکبەردانی سپێدەیش لەوانەیە مەحاڵ نەبێ..
من ئەو زانیاریانەم
لە گەڵای پایزو..
هەنگاوەکانی (با)و

کلیلەکانی وەهم .. خوێندنەوە
ئەوەتانێ بە بێدەنگی هاوار دەکەم
بە ناو پێچەکانی ڕووخاندا..
هەموو بۆ لەیلای خۆیان دەگرین..
کەچی هەمووشیان خۆیان ئامادە دەکەن بە شەقامە
خەمبارەکاندا ڕاییکێشن
خودایە چ دەبینم؟ ئەو هەموو کەڵڵبە تیژانە؟
بۆ تەنیا هێڵێک و چیتر نا ..!

**1996/2/15**



## (17)

داهێنانیان
لە کێل کردنەوەی دیواران بە دەورماندا کرد..
بێدەنگیمان دزرینگێتەوە!
خەونەکانیشمان لە گۆشەیکی ڕەشداگەڕاودا
هەڵکوڕماون...
بڵێی پیری
ڕۆحی ئەوەیشی گرتبێتەوە کە پێیان دەگوت نیشتیمان؟
تا هەموو ئەم دەوروبەرە کاکی بەکاکییەو

ئەم خۆرە بەشەوقەو
شاخە بەرزو
سەرچاوە سازگارانە
بە تەنیا بۆ زانینی کەشو هەوا بن و هیچیتر؟
بەداخەوە پەیمانمان وانەبوو
دەنگ و سەدا لێک بدەنەوە
بەداخەوە..

**1996/3/4**



## (18)

ئەوە کارەساتی هەردووکمانە
ئیتر ئەوە دنیایە
هەندێ جار سپێدە ڕادەخەین
جاریش هەیە تاریکی بە خۆماندا دەدەین.
لەگەڵ ئەوەشدا،
هەست بە مانگ و ئەستێران دەکەین
بە دەمارانماندا دێن و دەچن..
هەر ئەمەش تاقە دڵنەواییمانە بۆ بەردەوام بوون

بە دوای ئەو بوونەوەرەی
بووە بە گاڵتەجاریی هەمووان!!
کە ئەویش جددیەتە
بەڵێ هاوڕێم..
ڕاستیی لاوانەوە بەس نییە ...
ئەمە کارەساتی من و تۆیە.. هاوڕێ..!
با ئێمەش بە هەندی وەرگرین و شانی بدەینە بەر
شەوگار بێ شک لێ دەچێتەوە..
با شانی بدەینە بەر..

**1996/3/18**





## (19)

**سەری میکروباوی هەیە**

**ئیکیوس بە دوایانەوەو لیژنەی نێودەوڵەتی شوێن پیان هەڵدەگرێت، بەڵام چ بکرێت لەگەڵ ئەو کەللە میکرۆباویانەی تاریکیان لێ بەوەلەد دەبێ و کاولکاری هەڵدەنێن؟! و هیچ باس و هەواڵێکیان لەیایلەکانی ئیکیوس و لیژنەکانی دەوڵەتی و نێودەوڵەتی وە نییە؟**

شەمشەکوێرەن لە تیشک دەترسن
سەریان بە وەهمێک پڕ دەکەن ڕۆژگار لە بیری کردووە
حاشا لە سپێدە دەکەن.
حاشا لە برینان دەکەن
دڵیان ژەنگی هەموو ڕۆژگارانی گرتووە..



وای لێهاتووە کینەو قینیان بە دەماراندا دەخولێتەوە
شمشێری دۆنکیخۆتی
بەشان و باڵی کەسانی دی هەڵدەکێشێن
لە کۆنکریتدا دەچێن و
لە تیشک دەترسێن
ئەمانە سەری میکرۆباوین
کە باسیان
نە لە فایل و لاپەڕەکانی ئیکیۆس و
لیژنە نێودەوڵەتیەکان و
نا دەوڵەتیەکاندا هەیە..

**1996/4/3**

## (20)

چ دەبێ ئەگەر پەنجەرەو
دەرگاو ڕێگاکانیان بەڕوو داخستین؟
چ دەبێ هاتوو ئارەزوویەکی شێتانە بەسەری دادایین؟
وەک چۆن دوژمنە نەزانە دواکەوتووەکانمان
بە جیهانی بە ناکزوری و
پیربی و
بە کۆت و بەندە داپۆشراویان..
بەسەر خەونەکانمان دادەدەن..



چ دەبێ ئەگەر هاتوو جەستەی ماندوومان بە ژیان و
جودایی و
تژی ژوان و مردن گازە ژاراویەکانی دەردایەوە.
جەستەی ماندوومان بە ژیان و جودایی و
تژی ژوان و مەرگ..
هاوڕێ
ئاخۆ تۆ حسیابت بۆ ئارەزووی پڕ لە شێتایەتی؟
یا ئەم ناشیرینیە سەرنجراکێشە کردووە؟

کە لەگەڵ ئەو جوانیە کرێتەدا لە مۆڵگەیەکی نەبینراودا
لە یەک سەنگەردان؟
ئاخۆ حیسابت بۆ ئەوەکردووە؟
تاکەی لە پەنای بێدەنگی بین و
سەدای دوژمنە دواکەوتووەکانمانیش
بە دنیای بە ناکزوری و
پیریی و
کۆتەوە داپۆشراو
بەسەر خەوەنەکانماندا بدەن؟

**1996/4/18**



## (21)

ئا لێرەدا
لەو کەنارە ڕووتەڵانەدا دەمێنمەوە...
ئیتر وای لێهات ڕۆحی بە خەم چەکدارمان
پەردە بۆ هەموو شتێک دەدووڕێ
بۆ لانەوازیمان نەبێ..
کە لە دەرەوەی مێژوو جوگرافیادا ماوەتەوە

ببوره!
مەوداکانیش لەگەڵ ئێمەدا پیربوون..
ئیتر سوودی چییە؟
بە یەک بگەین و گۆرانی بڵێین و یەکدی ماچ بکەین؟
هەموو ئەمانە کەڵکیان چییە؟
لە کاتێکدا خانمی ئاسۆ
مانگێکی ماندووە بە ساڵانی زڵکاوو



خوانە بۆگەنبووەکان..
ببوورە...
من لێرەدا دەمێنمەوە
لەسەر ئەو کەنارانەدا ڕادەکشێم
ئەوان ئەوەتا دەقەو
کاتژمێرو
ڕۆژەکانیش دەنێژن...
خانمی ئاسۆیش مانگێکی ماندووە بە ساڵانی زڵکاوو
ئەو مەودایانەی لەبەریاندا نەماوە، ئیتر پیربوون...

**1996/5/3**





**(22)**

سەرەتای حیکایەتەکە ئەوەیە:
خانم لە پشتەوەی ئەوان درەوشانەوەدایە
کە بە عەزیمەت گرتنەوەو
بە ئاستەمی پێگەیشتن و
ڕاستیە ڕووتەکان دەچێت..
حیکایەتەکە ئەوەیە:

خانم هاواری خۆی لە وێنەی سرووتدا دەخوێنێتەوەو
لە پشتەوەی پەردەکاندا خۆی حەشار دەدا..
چاوەڕوانی ئەو ئارەزووەیە
کە زۆری نەماوە ئاسوودەیی ئەبەدی وەدەست بێنێ..
ئیتر هەست بەزەمەن و
بە جوانی شتان ناکات
ئەو فێربووە وەکو شەپۆل بە ناو لم دا بڵاوبێتەوە..
تاوەکو جارانی لێ بێتەوە.. لێ بێ هوودە..
ئا ئەمەیە چیرۆکەکە..

**1996/6/3**



## (23)

هیچ وێستگە و بەندەرێک نەماوە
ماڵئاوایی تێدا بکەین
نۆش!
ڕووبارەکانتان خواردەوە
جۆگەکان
کانیاوەکان.. هەمووی...

نۆش!
ڕێگای دۆزەختان کورت کردەوە..
لە سرووشتی دەست بۆ نەبراوەوە
تا باخچە پلاستیکیەکان
کە بە وشکایی دەدێردرێن..
بە ڕاستی ئەمە دەرئاوێشتەی
ڕۆچوونتانە لە هیچداو
لە (جاران وا بووینداا) کە لە ناخماندا
هێلانەی چێ کردوە..



بەڵام تاکەی (جاران وابووین) لە بن هەنگڵمان بنێین؟
بوونەوەری بە پیریی ڕۆژگارانیش داپۆشراو
هاتن تەنانەت ڕوانین و چرپەکانیشمانیان دزی..
مەوداکانیش وەکو خۆیانن
بەڕاستی ئامێزی مردوو
ماچی مردوو پێمانەوەیدا
ئیتر یا ژیان یاخود ژیان
بەسە هاوڕێ!
ئەمە چ بانیژەیەکە لێیەوە دەڕوانین!؟

**1996/6/18**

**(24)**

تا وەرزێکی نوێ تۆمارکا
باڵندەکان تاوانی بەجێهێشتنی هێلانەکانیان دەکەن
ئەو کاتەی لە وشە زیاتر شک نابەین
پەنجەرەی ژوورەکەمان چەند جوانە..
لە شەو ڕاکشان و
دەروشانەوەی مانگ..



خودایە تۆ شایەد بە ئێمە دەژین..
ئەمەش قەت لە بیرناکەین کە ئێمە دەژیان..
درەختیش هەر بەو چەشنە
لە نێو وشکایی باخچەکانماندا
ڕەنگ و ڕوویەکی دیکەی هەیە..
ئەڵڵاە... ئەستێرەکان چەند نزیکن
دڵ چەند دوور..

**1996/7/3**

**(25)**

کڕنووش..
پەردە دادەدرێتەوە
ئاوازگەلێک ڕادەبوورن
من خەریکە لێیان پڕ دەبم..
کڕنۆش!
بۆ وشکەڵانی
کە پێش ئەوەی وشکایی ڕۆژگار
سەوزایی لێ بسەنێتەوە



بەهەشتێکی خەمباربوو..
ئەمە گەڕەڵاوژەی شێت بوونە
بە دەمارانماندا دێ و دەچێ..
کڕنۆش!
سووتان!
شەوق ساچمەی سروودێکە ڕۆژگار توڕی داوە..
پەرش بێ..
لەمە زیاتر نزیک مەبەوە لێم
وام لێهاتووە

له نێو لۆچی سیماکاندا نەبێ نەتبینم
دڵڕەقیی!
ئەوا گۆرانی ئاو
لە خەونەکانماندا بە یەکدادێن..
لە چیدا پەرت بین
لە چیدا لێبچینەوە
لە کاتێکدا ئاوازگەلێک بە شەقامەکاندا تێدەپەڕن و
خۆیان دەکوژن..

**1996/7/18**





**(26)**

لێم گەڕێ وەکو خۆم بمێنمەوە کە خەون دەبینم.
لێم گەڕێ خەیاڵی ڕوناهی و خۆشەویستی و بەرائەت
بکەم
کە ئەوە چەندین جارە لە تیرۆرکردن رزگاری دەبێ..
وێرای هیچی هیچکاران و
دەمامکی ساختەچیان..
لێم گەڕێ وەکو هەم
بە بێدەنگی .. هاوار بکەم
تەنیا بەبێدەنگی..



ڕووناهی و خۆشەویستیت پێ زۆر نەبێ بۆم
من خەریکە زمانی ئاوو
قەڵبەزەی شەپۆل و
سروودەکانی دڵڕەقی لە بیر دەکەم
کە ڕۆژگارێک بە خەونی ئەوانەوە
دەژیاین و دەمردین..
بۆمن بە زۆری مەزانە ئەی ئەو ڕۆحەی
لە باڵی ئەو پەپوولانەوە هەڵدەچی
کە ڕەنگی ڕەشەباو
ڕەنگی یەقینیان هەڵگرتووە..

**1996/8/3**

**(27)**

پەردەیان دادایەوە
نوور، کەس بەلایەوە ناچێ..
بروسکەی بەرەو ڕەشەبا هەڵدەدا..
پەردەیان دادایەوە..
بێ سوودە هەوڵ بدەی شتێ ببینی
ئەوە دوا سەنگەرە
ئەگەر هەڵنایسێین



ئەوا ئەوەی هەندی جار ناومان ناوە عەشق
هەندێ جاریش (ڕەهایی)
دەستمان لێ دەوەشێنێ..
غەریبین..
ئێمە غەریبین
لە کوێی وەلانانی لەزەتبازی و
لە باوەش گرتنی وەجدو درەوشانەوەداین؟
ئێمە لە کوێین، ژنی شین!
کە گەیشتویە ئەوەی تێم بگەی و تێم نەگەی
ئێمە لە کوێی ئەو هێمایانەین

که ئازار گەڵای پێ دەردەکردو
شادی پێ سیس دەبوو ؟
تاماوم لە سروود وتن ناکەوم
ئاخر گوڵەگەنمیش وەهمی خۆیان هەیە
ئیتر چار نییە دەبێ ئێشی جوادیی بچێژین
ئەگەر پێکگەیشتن
لە چەشەیەکی کاتی تێنەپەڕێ..

**2006/5/16**



**(28)**

ژوورەکەم بەڕووی سەفینی سەرکەش دا
تۆماری مەزنی شکست و سەرکەوتنان
بانیژەیەکی هەبوو
بەسەر کێڵگەی ترێ و
باخچەی گوڵە کێویلان و
خەم و خۆشیانی دەڕوانی..
بێ ویستی خۆم بەجێم هێشت
ئینجا قەت باڵندەیەکتان دیوە
بە حەزی خۆی هێلانەی جێ بهێڵێ؟

ئەوەتانێ دەگەڕێمەوە و
هەندێ لە خەونەکانم لە بن هەنگڵ ناوە
تا جارێکی دی بەسەرتان بکەمەوە
پردێک لە خۆشەویستی لە نێوانماندایە
کێڵگە بە ڕووباران و
چاوەکانیش بە ئاسۆ
دەنگیش بە سەداوە دەبەستێتەوە..
با شەوگار
کەیل، لەسەر شۆستەکاندا لێبچێتەوە..
باجارێکی دی سبەی
باوەش بە منداڵیماندا بکاتەوە.

**2004/6/12**





دەمامک بە سەریەکدا کەڵەکە بوون
پێشان دەمامکێک بوو.. ئێستا زۆر بوون
خودایە چۆن لە ژێر ئەو هەموو دەمامکانەدا
هەناسە دەدەن؟
چۆڵەوانیە ئەم خاکە..
چۆڵەوانیە ئەو گیایەی لە سرووتاندا ون بووە
شتی گرنگتر هەیە لەوەی ڕاتاندەکێشێ
ئەوە سەر ڕەشن
شێتایەتی خۆیان لە کەنارەکانی شەودا بڵاو دەکەنەوە..
**2005/6/20**



**(29)**

دیوتانە کەسێ ئاهەنگ بۆ گۆشەگیری خۆی بگێڕێ؟
ئەمە دەسەڵاتی ساڵانە
لوولی دەدەین و لوولمان دەدا
سەرسوڕمان بە پێداهەڵگوتنەوە
بە سەرماندا باڵەفڕەیەتی
ئێمە خەریکە لەگەڵ بادا تێک دەکەینەوە
ڕۆژگار یاداوەریی سووتاندین

**(30)**

تەنها عاشق
هیوایان دەمێنێ، نابڕێ..
تەنها عاشقن لە گۆڕانی چریندا بەردەوام دەبن..
ژیان شیرینە هاوڕێ!
شنەی با بە تاوەوە گەوەڕان دەبڕن
ئێمە بە جێمان نەهێشتبوو
هەنگاومان دەست لە ململانێی نزیک دەبێتەوە
وێڕای سەرکێشی ڕۆژگارو شوێنکات و ڕوانینی
جەنابی زاڵمان



پایز دەکەینە گۆرانی
سواری هەوران دەبین..
دەشبینین چۆن زۆرداریەکانتان بە بیر دێنینەوە
کە کۆتاییان نایێ
دەبینن چۆن دوێنێتان بەسبەیەوە دەدۆڕێنن
ئێمەش چۆن دەبینە خاوەنی سبەینێ..
هاوڕێم پەنجەرەکان هەموو کراوەبن
تا خەونەکانمان پەرش و بڵاونەبنەوە
هەردووکمان بە دڵنیایی شادبینەوە
با هەتاو بەسەرماندا هەڵبێ..
ئێوە خۆرێکتان هەیە شایانتانە
ئێمەش خۆری شایان بە خۆمان هەیە..

**2004/6/27**

**(31)**

سپێدە بنەوشەییەکانی (عتێشی) و شەوانی

«عەباسیە»ی خەوبەرو

خەون و بارانی (ڕشت)

ئەمانە چەند وێستگەیەک بوون لە ژیانی بەندە

کاتێک دوورگە وشکەڵان بوو

قەلەڕەشیش بە چوار دەوریدا دەسوڕایەوە

ئێمەش بێ هانا ، بێ ئەستێرەیەک ڕێگای پێ ببینینەوە

ئەوان ونیان کردین

ئێمەش ڕۆژگارمان لەگەڵ ئەواندا بزر کرد...



کاتی ئەوە هاتووە دڵ زامەکانی بسڕێتەوە

شنەی با پەنجەرەکانمان دەکوتێ

کە دەڕواننە باخچە هەڵبزرکاوەکان

کەی دەتوانین

ڕاوی نوور لە شەختەدا بکەین؟

گۆشەکانمان پێویستی بە ڕووناهی یە

ئاگریش ئیتر ڕووناکمان ناکاتەوە..

برادەر!؟ **2004/6/4**

**ئاماژە:**

---

*** «العطیشی و العباسیە» یەکەمیان ناحیەیەکە سەر بە پارێزگای کەربەلا، دووەمیشیان سەر بەپارێزگای نەجەفە کە نووسەر چوارساڵ و هەندێک بە دوور خراوی تیایاندا ژیاوە.**

*** ڕشت شارێکە لە ئێران، نووسەر ماوەیەک لە نێوان ساڵانی 1975-1976دا دیسان بە دوورخراوەیی تێیدا ژیاوە**

**(32)**

چاوە داماوەکان
هەمیشە چاوە خەمبارەکانن..
لەسەر سینەتدا ڕادەکێشم و
لە چاوەکانتەوە ڕادەمێنم
کە بە فرمێسک پاک بوونەتەوە..
بەرەو کوێ سەرهەڵدەگرین؟
چ گۆشەیەک داڵدەمان دەدات؟
با گوێ لە چرپەکانمان بگرین



ئاخر چرپەیش ئەلف و بێی خۆی هەیە
تەنها ئەوانە تێی دەگەن
هاوڕێیەتی گەرداویان کردووە..
ڕەشەبایش تژی خەمە
یادەوەریش لەسەر شۆستەکاندا دەسوڕێتەوە..
کەژاوەکان بە بێدەنگی تێدەپەڕن..






ئەمە گوناهی سێوی یەکەمینە
تێکمان دەشکێنێ..
وەک چۆن کریستاڵەکانی بەهەشتی
لە بێ خەبەری ڕۆژگاردا تێکشکاند..
گۆرانی بەیانیان لاوکی تەلانانە ...
لە سەرچاوەیەکدا هەڵدەقوڵێ
عاشقان توڕیان داوە
چی دی...؟

**2004/7/11**

**(33)**

چەند قەڵایەک لە لم
کۆمەڵە تارماییەک لە تاریکیدا لێ دەچنەوە
کۆمەڵێکی دیکە لێیەوە لە دایک دەبن
دەنگێکی لاڵ..
تیشکێکی تاریک..
کۆمەڵە چەمکێک



لە ژێر باری ئەستێراندا تێکدەشکێن
چەند چارۆگەیەکی تیزماڵ تیزماڵ
لە کەنارێکەوە بۆ ئەوی دی
تووڕمان دەدەن..
وژەی با خەونەکانمان دەقرتێنێ
کەنارگەلێک بە قەوارەی دڵ
سپێدەی تژی یادەوەری
شۆستەکان لە تێکچڕژانی گەڵاکانەوە سەرسامن

کووچە بەرەو ڕوو لە بنبەستدان
ئەمە هەوڵێکی دیکەیە بۆ گریان
لە سەردەمێکدا فرمێسکی تێدا قەتیس ماوە
چەند قەڵایەک لە لم
گەرداو ڕەزمی گۆڕیون
هاوڕێ بیر لە چی دەکەیتەوە!؟
با پێ هەڵێنین و لە پەنجەرەکە نزیک بینەوە
داڵانی بە دەرەوشانەوە پۆشراو
هەور ئاسا لە بەردەم قەڵا لمیەکانماندا پەرت دەبن
چارەنووسم وابوو لە پێچ و تەلانان زیاتر نەبینم



دڵ ڕەقن .. نیشتمانەکەم
دڵ ڕەقن .. ئەو کەللە پووچانە
شەو باڵی بەسەر دڵیاندا کێشاوە
دڵ ڕەقن نیشتمانەکەم.. نە لەگریان و نە لە پێکەنین
دەگەن
دڵڕەقن ... دڵڕقن.. نیشتمانەکەم..

**2004/7/25**

## (34)

پرسیارت لە وەهم و لە گەوهەر لێ کردم..
ئەو دەیویست خاکی تازە بدۆزێتەوە
سەرنجیم بۆ ئەوە ڕاکێشا
کە جوانی دەشێوێنێ..
بەڵام بێهوودە بوو..
ئێمە شایانی ئەوەین..
بەهەشتی خەیاڵی بەسەر ئەو خەراباتانەوەیە
پڕ لە منداڵیی و ستران



مانگی لە وێنەی خەوندا دی
وەک هەزار بە هەزاری قژی
کە لە هیچ ناچێ لە درۆ نەبێ
لە هەر کوێیەک بێ سرووشت بەرەو ئەوێ دەچێ
ئا لێرەوە با هەڵدەکاو
کانیاوەکان کەزیەکانیان دەدەنە بەر با
جارێکی دی خۆشم دەوێی!
خۆشم دەوێ بیرەخەوی نیوەڕۆیان!

دڵتەنگیش کێڵگەی خۆی هەیە.
ئەمە ژیانێکی نوێیە بۆمان نووسراوەتەوە.
لە کاتێکدا نووستووین خەون دەبینین.
دەسا با بەڕووی شەپۆلەکاندا بقیژێنین
وەک چۆن ڕۆژێ لە ڕۆژان هاوارمان
بە ڕووی هاوکێشە لاسەنگەکانی
نێوان وەهەم و  گەوهەردا کرد..

**2004/7/25**





**(35)**

ئەو زەردەخەنەی دەیبینی
وەکو ئەفسانە ڕۆژگار دەبڕێ
خۆت ڕاگرە!
خەریکە لە ڕووناهی نزیک دەبینەوە
خۆت ڕاگرە!
هێلانەی جاڵجاڵۆکان تێک دەدەین..
ڕامان، ماندووی کردووین
کاروان ڕوو لەئێمەیە، بەڕێوەیە..



با پێکێکی دیکە بخۆینەوە..
بێداری وازمان لێ ناهێنێ..
بێداری وەکو باڵندەیەکی نەگبەتی
بەسەرماندا باڵفرکەیەتی
با پێکێکی دیکە بخۆینەوە
ئەو خەندەیەی دەیبینی

وەکو ئەفسانە ڕۆژگار دەبڕێ
ئەوە منداڵییە، بێ وادە
سەردانی پیریەتیمان دەکات
دەبا پێکێکی دیکە بخۆینەوە..
بێداری ماندوومان دەکات
زۆرداریەک جەستە دەخاتە لەرزین



سترانیش یادەوەری دەکۆڵێ
بووکەکانی چیا
بە دەوری کانیاوەکاندا دەلەیزن
بوونەوەری ناکاو
لە لێژاییدا کەیلن، بەلادا دێن..
خۆراگربە! بەهێزبە!
خەریکە لە ڕووناهی نزیک دەبینەوە.
لێم مەپرسە دەست بە دەم چاوی کێدا دێنم
ئەوە ئەو خەندەیەیە کە دەیبینی
دەڵێی ئەفسانەیە ڕۆژگار دەبڕێ..

**2004/8/1**

**(36)**

چیتە بەسەر هەموو بڵندابیبە ڕەق و خاوەکان
لە شەقەی باڵان دەدەی؟
چت بەسەر هاتووە؟
بێ ئەوەی ئەو کەنارانە سەرنجت ڕابکێشن؛
سۆزیان لێ دەبێتەوە
ئەو فرمێسکانەش کە بەقەد بارانن
هیچیان بۆ نەماوەتەوە، لەوەی بەدەر



ڕەگەڵ هەورە کۆچەریەکان بکەون..
چیت بەسەر هاتووە ڕکابەر؟
وامزانی تۆ ڕووبارێکی
کەنارەکانی ڕووناهی دەدێری
بەڵام داخەکەم وێنەی شەرەنگ
بە ناخمدا تێپەڕی..
چیت لێ هاتووە؟
حەز بە ژوورە تاریکەکان دەکەیت و

ڕقت له خۆره!!
کەواتە ژیانی خۆش و گومڕایی و ون بوونت خۆش!!
خشتەی درۆی ڕۆژانەت خۆش!
ڕۆژگاری تۆ بەسەرچوو
زەمەنی قسە و نیگای بەتاڵ و
ئەو خۆشەویستیەت خۆش
کە قەتاوقەت، ڕۆژێ لە ڕۆژان تێی نەگەیشتوویی و
تێی ناگەی...

**2004/8/8**





## (37)

جوامێر لە هیوا هەڵکێشرابوو..
شتێکیشی لە سنگدایە ئەو پیاوە
لە هاواری سۆزێک دەکا
وڵاتی تەی کردووە..
شوێنێکی نەدۆزیەوە
ئەو سۆزەی تێدا بەرِەڵڵاکا



ئەو پیاوە کە سواری هەور بوو دەبارێ
بڕیاریدا هاوڕێیەتی پاسەوانەکان بکات و
بچێتە ناو شار.. بێهوودە..
ئەو تەنیا شایەتێک بوو
لە کەنارەکانی نوورەوە هاتبوو
بەڵام دیاربوو شار نووری نەدەویست
شار نووری ناوێ..!

شار سۆزی ناوێ..
ڕۆژگار چی لێ کردوون؟
تارماییان پەسندتر بکەن؟
وەک لاڵان لە تاریکیدا بۆڵە بۆڵتانە.
ئەو پیاوە لە هیوادا هەڵکێشراوە
هاوارکە جوامێر..! هاوارکە و
بارەکەت لە چەقی ڕێگای چۆڵ و بەردراوادا لێ خە..
ڕەنگە ڕێگاکان بەڕەحمتربن
لەو شارانەی تارمایی لە نوور لەپێشتر دەگرن
هاوارکە .. براله..!

**2004/8/15**



**(38)**

دەبووایە بە دوای ڕێگەی دیکەدا بگەڕێ
هەوڵێک بۆ دۆزینەوەی کەش و هەوایەکی نوێ
مەودای پەلهاوێژ .. وێنەی هێما
وەک نیگەرانی ماڵئاوایی
ئەوان بە دزیەوە دێن
ڕاپۆرتی بە درۆداپۆشراو دەنووسن
وەک دەم و چاوە دەمامکدارەکانیان
دەردەکەون و وەک سەرابیش ون دەبن..

هیچ چەمکێک شک نابەن
بۆ دوێنێ و ئەمڕۆ و سبەی..
ڕاستە دیوارەکانی دەوروبەرمان بەرزن
بەڵام پێیاندا هەڵدەگژێین
دەبینی چاوە دەرپەڕیوە حەسوودەکانیش
دەمان بینن بەرز دەفڕین



هێدمە دەیانگرێ
چیرۆکی باخچە ڕەنگاو ڕەنگەکان بەم جۆرە بوو
باوەشیان بە گۆرانی چیاو دۆڵەکاندا دەکەن..
تا بە شنەیان بسێنەوە
نهێنی بێ تاوانیی تەنها بۆ مانگە، مانگ
بێداری جاویدان..

**2005/5/22**

**(39)**

ئەوەی دەرکی (پێ ناکرێ)م هەڵوێزنی
لە ڕێگای درێژو بە کەندو کۆسپ کە ناوی تەمەنە
تۆ لەگەڵمدا بووی
بۆیە سەفەری ڕووەو نادیاریشم،
وەک پیاسەیەکی ئێواران بوو..



پێخواس بووم، لە خۆشیدا باز بازێنم بوو
هەستم بە تیشووی بەردان نەدەکرد
کە پێیان بە خوێن دەهێنام
خەونێکمان پێ بوو
ڕووبارو چیاو باخچەی لە تۆغیانی بەهارێی تێدابوو
بەڵێ ئەو شەوەم هەر لە بیرە
کە پەنجەت بۆ مانگ ڕاهێشت
وەک ئەوەی بڵێی بابیکەینەماڵی خۆمان

باوابێ خۆشەویستەکەم .. بابیکەین
لەوێ دیوارەکان بە نوور هەڵنراون
ژوورەکانیش بە نوور داپۆشراون.. زەویش نووری لە سەر ڕاخراوە
دەرگاکان.. پەنجەرەکان.. هەمووی لە نوورن
بەم جۆرە نوور ڕوو لە نوور
بەڵام ئایا تۆ بیرت کردۆتەوە چ دەقەومێ
لە کاتێکدا تۆی نووریش
باوەش بەو هەموو نوورانەدا دەکەی؟

**2004/8/29**





## (40)

له تەوقی سەرەوە تا نووکی پێ کوژاوەتەوە
وای دێتە بەرچاو
هەنگاو بەرەو خەون.. بەرەو هیوا داوێ
بەڵام ئەو لە ڕاستیدا وێنەی چڵە ڕووتەڵەکانە..
کەس نەمابوو بە لایدا نەڕۆیشتبێ و
جۆللانەی لێ شەتەک نەدابێ



ئەو مارێکە لەنێو زبڵ و زڵکاو خۆی دەپارێزێ
بای نێو کووچەو کۆڵانان دەبینێ
گوێ بۆ خۆرئاوای کارەبادار هەڵدەخا
کە ویستی بگری، دەگری
کە ویستی پێبکەنێ پڕ بەدەم پێدەکەنێ
ئەو ئامێرێکە بە دەستی دەڵاڵەکانەوە
قەت ڕێکەوتی خۆشەویستی نەکردووە

هیچیش لە جوگرافیاو مەوداکانی نازانێ
لەوە زیاتر پردێک دەبێ بۆ گـەیشتن بەکـەناری گـەمـەو
گومڕایی...
ئا ئەمەیە نهێنی خامۆش بوونی و
نهێنی ئەوەی ڕۆژێ گەشایەتی بەخۆیەوە نەبینێ
دووبارە پیرۆزت بێ ژیانی گومڕایی و ون بوون..
پیرۆزە لیستی رۆژانەی درۆو
بۆنی پاشەڕۆ بۆگەنیەکان..

**2004/9/5**



**(41)**

باڵە ماندووەکان هێشتا خۆیان بەبادا دەکێشن
مێرگ زەرد هەڵگەڕان تا مێرگی دی سەوز ببنەوە
مەیخانە سەرخۆشیان لە بەرامبەردا کەیلن بەلادا دێن..
درەوشانەوەیەک لەوێنەی سەرابدا
«وەجدێک» وەک گریان
لێم گەڕێ کە باهەڵدەکات ماچت بکەم
لێم گەڕێ ماچت بکەم..

ئا ئەوەتا شەقام و شۆستەکان
کەنارگەلێکن بۆ سەرخۆشان
ئێمە لە کوێی نهێنییەکانداین؟
ئێمە لە کوێی کانیەکانی نووردا‌ین؟
لێم گەڕێ باماچت کەم..
کەس نییە لە خۆم بەدەر بیدوێنم...
کەشتیەک شک نابەم
هونەری ڕۆژگاری بێ وەفایش بەڵەدنیم



هەمووی هەمووی چەندساڵێکی زێدەیە
کێڵگەکانی گەنم زۆریان نەماوە بنوون
بنبەستێک بەرەو خۆیم ڕادەکێشێ..
تۆز لە قوڕێ هەڵدەستێ
دەبێ بەرائەت لە کۆگاکانی سەردەمی دلڕەقی ئازاد کەین
ڕۆژگارێکی بێ ڕەحمە
دەبێ بێگوناهی ئازادبکەین...
مەگەر وانیە؟...

**2004/9/12**

**(42)**

ئەوی دی، ڕێگەیەکی بنبەستە
با، دەستبازی لەگەڵ گوناهدا دەکا
سروودەکانیش لە ناوەختدا دەخوێندرێنەوە
بەهێزی هێمایەکەوە گەڕانیەوە
لە باوەشی خۆردا لە دایک بوو بوو، نەشونمای کرد بوو
ئەوساو ئێستاش
چەتری خەونانە..

* * *



ئێمە دەمێنین و
هەوڵ دەدەین ئاوازێکی جیاواز لێبدەین
لەگەڵ ئێرەیی حەسوودان و پیلانی بۆرەپیاوان
کە خۆیان لە پاکی و جدیەتەوە مەڵاس داوە..
بێگومان ئاوازێکی جیاواز لێدەدەین
ڕەنگە ناوی لێ بنێین ئاوازی شێت بوون
تەنیا شتیش لە پێش ئەوی دی بێ
هەر ئەوەیە
ڕێی داخراوی خۆی بگرێتەبەر و هیچیتر..

**2004/9/19**






**(43)**

ئەمشەویش
تۆم لە خەونێکدا بینی لە خەیاڵاندا نەبوو..
تۆم دی نەخۆش و کوژاوە بووی
دەست لە مل تارامایی
ورتە ورتت بوو شتێکت دەگووت
تێنەدەگەیشتم چیت دەگوت..
کە بەرەو ڕووت دەهاتم

لەوە گەیشتم دەتگوت
باسەرلەنوێ دەست پێ بکەینەوەو
لە درۆیەکی دیکەدا بژین..
ئەمە ساچمەی سۆزێک بوو
لەگەڵ رۆژگاردا پەرش بوون
چیتر گەشانەوە ئاساکەی جاران نەما...
کە بانیژەکەمی رووناک دەکردەوە
ئەو بانیژەیەی رۆژێک لە رۆژان



بەسەر رێگا نادیارەکانیدا دەڕوانی
بەڵام ئەسەف زۆری پێ نەچوو
خۆم بینی لە خەو ڕاپەڕیم
وەجدێک گرتمی
تەنیا ئەوەم بۆ مایەوە دامە پڕمەی گریان
بۆچی ئەی دەستبازی فێڵباز
تەنانەت لە خەونیشدا...؟
بۆچی؟؟

**2004/9/26**

## (44)

دوێنێ دوورو
سبەینێ دوور
بێدەنگی (شاد)ی دواخراویش بەرگەی ناگیرێ
ئەستێرە بردیان
لە پێناوی دڵدا بە چۆل و چیایان کەوتوون
جارێکیان کەفافی گوتی
«رەنگە ڕووناکی ئازارێکی دی بێ



کێ دەزانێ چەند شتی نوێی دیکە دەردەکەون»
زمانم خەریکە بگرێت
لە کـاتێکدا لەبەردەم شـوورەی خـەمـێکی سـەرمـەدیدا
وەستاوم
ڕامان دەم و چاوی ماندوو کردووین
پێویستە ئازار بچێژین
تا هەست بە جەستەمان بکەین..
ئازار.. ئازار

چەمکی ون..
لەو بانیژانەی بە زۆر بەجێهێشتراون..
ئەی شەبەنگی چارەنووس!
پاڕانەوە لە تۆ گۆرانیەکە
نابیسترێ.. دەبینرێ..
گۆرانیەک دوێنێ دوورو
سبەینێ دوور نزیک دەکاتەوەو



شادمانیش ئازاد دەکات
کە لە کلاورۆژنەی
ژوورەکەمدا ڕەنگ دەداتەوە
ئەوەی کەوتۆتە ژێر تەپوتۆزی مێژووەوە
دەستم دامێنت
ئەی شەبەنگی چارەنووس.!

**2005/11/4**

## (45)

شەپۆل دادەمرکێنەوەو لێدەچنەوە
ئەوە ئەو فرمێسکانەن باخچەکانی گوناە ئاو دەدەن..
ســـپـــێـــدەی لە خـــاچ دراو لە پشـــتـــەوەی چاوە
فرمێسکاویەکاندا
چیاکانیش بەرەنگاری سەرکێشیی گەرداوان دەبنەوە



ئەو دالآنانەی باسیان دەکەی شوێنەواریان نەماوە..
ئەو کێڵگانەی خەونت پێوەبینی ئاسەواریان نەماوە..
زەمان زەمانی جادەو شۆستەکانە
زەمانی سەرابی گەشاوەیە لە بیابانبوونی ڕۆح و
لە جوگرافیای ڕێیە نەناسراوەکاندا
کە مێژوو پشتی تێ کردوون...
ئای ئەمرۆ چەند بە دوێنێ دەچێ
خوێن گوڵ دەکاو
بێدەنگی گەڵا دەردەکا

کێ ئەستێرە دزراوەکانی
سەر بانێژەکەمی پەرت کردن
لەو ساوە (ئاوابوون)، یەخەم بەرنادا
(ئاوابوون) یەخەم بەرنادا
ئەی چاوە خەواڵوە دوورەکان
فریام کەون..!
ئەمە ڕۆژگارێکی پیرەو لەوپەڕی تینیدایە
ئەوە زەمەنی جادەو شۆستەکانەو
ئەو سەرابە گەشایەوەیە لە بیابانی ڕۆح دا
فریام کەوە ئەی ئەو چاوانەی
کە ئاسمان ڕەنگی پێ بەخشیون..

**2004/10/10**





**(46)**

چەند هێمایەک
گەشی و ئاوابوون بەرجەستە دەکەن.
لە نێو ئەو لوتکانەی لە چاوەڕوانی دا بێزاربوون
با ژیان وەک ئێوارەیەکی ڕوون ببینین
با ئاگری خەم بکوژێنینەوەو
دارستانی کامەرانی جۆش دەین
ژێییەکان بۆ ژەنین دروست کراون



نهێنی ساتەکانیش مەملەکەت و ئیمپراتۆریەتیان هەیە
کە شێتیی و بەرائەت
لە نێو کۆڵانی شارە بە زۆر قەرەباڵغەکان
بڵاو دەکەنەوە..
باهۆز کەناران دەکەنەوە
یادەوەری هەڵدەکۆڵن.
ئێمە شایەنی باڵین
لوتکەکان ئێمە دروستمان کردن

«پۆلاّمان دێرا»
ئێمە شایەنی فرمێسکی نەمرین
بە پەنجەی لە بەفر
خەون ئیتر مەحاڵ نییە
دەبا دارستانی کامەرانی جۆش دەین
خەون ئیتر مەحاڵ نییە..

**2004/10/17**



## (47)

بڕوانە ئێمە لە کوێی
ئەو نامە لالاّنەداین
خوداحافیزیش سیحری خۆی هەیە،
سلاّو لە ئاسۆی ساویلکەیی
گەر ئەو قەدەرانەی تێدا بە نەمری بمێنێتەوە
کە ژیانمانی بە بەرائەت و جوانی ڕەنگ کرد.
بڕوانە ئێمە لە کوێی

ئەو ساتە ترسناکانەداین؟
کە بە شیعرێکی دواخراو دەچێ، ڕووبار و مانگی
لە ئامێز دایە
شیعرێک لە چۆڵەوانی تەنیایی و ژاوەژاو وەڕس نابێ
سڵاو ئەی ڕووناکایی ڕووناهی
سڵاو لە تارماییەکانی مێژوو و جوگرافیا
کە لە نێو بۆشایی گەردوونی داڵانە تاریکەکاندا
دەبریسکێنەوە
سڵاوت لێ بێ نزاکانی سپێدە
پاش ئەوەی بە داوی



شەوی تاریکستانەوە بوون..
بڕوانە ئێمە لە کوێین!
وەکو دوورگەیەکی سووتاو جێم مەهێڵە
یادەوەرییەکان هەڵلوشێ..
جێم مەهێڵە وەکو پەڕەیەکی سپی
هیچ شتێک نەنوێنێ..
جێم مەهێڵە وەکو ڕەزمێکی لاسەنگ
جێم مەهێڵە وەک پاییز
بە تەنیا بەرەو ڕووی چارەنووسی ببێتەوە
ج.. ێ .. م..م ـە هێڵە

**2004/10/24**






## (48)

سروودگەلێکی پایز
هەر زوو زستان لە ئامێزیانی گرتن
پرۆژەی هۆنراوەیەک بوو لە کریستاڵ
سامالێیک بوونایەتی خۆی بەجێدێڵێ و
پرد بۆ پیاوی خۆڵەمێشی هەڵدەنێ
ئەوانەی بەســەر یادەوەری لە خــاچ دراوی ڕۆژگــاری
پووچدا خۆیان ڕاگرتووە.

ئا ئەمەیە حاڵ، هۆنراوە ئازیزەکەم
بێدەنگی لە هاوار ڕاستگۆترە
هاوار وای لێهاتووە لە چەقی ڕێگا چۆڵ و هۆڵەکاندا
بووە بە وەڕین
هەواداریی پاڵی بە ئارەزووی جەستەوە داوە
ئەوەی لە ئێواراندا دەمێنێتەوە
جێگەی هەناسەیەکی پڕ بە سییەکانی تێدانابێتەوە



ئەوەی دەمێنێتەوە
بەشی ئەوە ناکا لە باوەشت بگرم
وەک چۆن لە تەلاناندا لە باوەشی ماندووم دەگرتی..
ئەمانە سروودی پایزێک بوون
هەر زوو
زستان لە ئامێزی گرتن...

پرۆژەی هۆنراوەیەک
نەخێر پرۆژەی گێژەننووسێک
کە سەرەتاو کۆتایی نقوم کرد
ئەمانە سروودی ساویلکەیی بوون
ئینجا بۆ ئەوەی بژیت
دەبینی شەو و ڕۆژ خەونەکانی دەکرۆژێ..

**2005/10/30**



## (49)

بۆرە پیاوان
مۆتەکە لە دەمامکە ژەنگ گرتووەکاندا دروست دەکەن
با زیندوەکان گۆڕەکانیان بەجێ بێڵن
ترس لە چی؟
لە نێو تارماییەکاندا لە کوشتارو جەنگ بترازێ
چیدی هەیە؟

هەنگاوەکانمان خستە سەر هەر ڕێگایەک
ڕۆحی شەڕانی تێدابوو
جیهانی من کە ناوم نابوو گۆشەکەم
تێکەڵوپێکەڵی جیاوازی لەگەڵ واقیعدای کەوتووەتێ
دڵەڕاوکێی لەزەتمان تێدایە
هەوریش بەداخەوە
چیتر قیسارەی لە چۆلەوانیی فڕێدراودا
وەدەنگ ناهێنێ..



بارانیش، ئەو باران نییە لە ڕۆح بسوێ
مۆتەکەکان وەک خەونی خۆش خۆ دەردەخەن!
لە کاتێکدا وانین...
زەنگی ترسناکیان
لە پاشماوەی جەنگەکان خواستووە.
لە نێو کونە کەندڕەکاندا
جار ناجار دەیخەنە سەر کیمیای وەجد
مۆتەکە.. مۆتەکە
بۆرەپیاوان لە دەمامکی ژەنگاوی دروستی دەکەن

بەڵام بێ شک شەوگار بەسەر دەچێ
تاڤگەکانی نووریش
ئەو بوونەوەرە سەیرانەو مۆتەکەکان لەگەڵ خۆ ڕادەماڵن
من لە گۆشەیەکی دیکەوە قسەت لەگەڵ دەکەم
لە گۆشەی «یوسف»و هەنگاوە ڕووناکەکانیەوە
گۆشەی کێڵگە کەسک و بەهەشتە واڵاکان..

**2004/1/7**



## (50)

کێڵەکانی تامەزۆریی
بە درۆیان ماندوو بوون
لێم مەپرسە
کە گوێ بۆ داکۆکیەکانت شل دەکەم
ئارەقەیان لێ دەچۆڕێ
وا دیارە ڕۆژگاری گەرم بوونەوەو
سرووتی درویێنەی خۆشەویستی
تاهەتایێ بەسەرچوون..

ئەمە قۆناغی لێک دوورکەوتنەوەیە
من دوورو
تۆ دوور
نیشتمان دوور
لە نێوماندا دڵەڕاوکێیەتی
ئەمەیە بەڕاستی دەرهاوێشتەی
ڕۆژگارێ
کێلەکانی تامەزرۆیی شەکەت کردووە..
کردنەوەی کانیەکانی
بە زۆربڵێیی مێزی کافتریای پێنج ئەستێرە سپاردووە.
کە باران شووشەی پەنجەرەکانی دەکوتێ





دانی پێدا دەنێم ئەمەی تۆ بیری لێ دەکەیتەوە
لای من نییە
هەموو ئەوەی لە ڕێدایە
هەست و
دیمەن و سیماو لاوکێکە
چیرۆکی سێوی گەست لێدراو دەگێڕێتەوە
ئەو درەوشانەوانەی
لە کونج و گۆشان ئاخنراون
ئیتر مەملەکەتی ڕۆحم نین و
کەنارێک نین بۆ خۆشەویستی
ئیتر تامەزرۆیش بە درۆیان ماندوو بوو.

**2004/11/21**



**(51)**

بە شەرمەوە
ئەوەتا چرا لە گۆشەکاندا هەڵواسراون
شەو بەسەرچوو..
خەتی کازیوەش ڕووی تۆی
کە لە ڕووپەڕی دڵی ماندوومدا داتاشراوە، شاردۆتەوە
لێو هەڵدەلەرزن..

دالآنی تاریک و دەیجوور
بۆ کوێ دەچێ؟
وەشانی تەنیایی
وەک گەڵای پایزن.
بە بەر چاوتەوە پەرت دەبن؟
دڵەکوتەی شەوق و تامەزۆریی گەڕایەوە
گەڕایەوە باڵەکانم ببڕێت..



کە لە ناپاکی باهۆزەوە خوێناوین
بۆ قیسارە شکاوەکەم؟
بۆچی تارماییم؟
دڵداریە شکست خواردووەکانت
لە جوگرافیای دڵم داوێی؟
بۆچی؟
من زەمەنێکم هەیە، لە دەرەوەی زەمەنی تۆدایە
مێژوویەکیش کە ڕەنگە بۆرەپیاوان

پشت گوێی بخەن
بەڵام بەندەکانی هەر دەمێننەوە
لە نێو خوڕەی جۆگەلە و هەناسەی درەخت و
سروودەکانی پایزدا..
ئەو مێژووە بە تەواوەتی..
لە ڕۆژو مانگ و ساڵانی
هەناسەبڕکێ بەدوای سەرابدا جیاوازە
ئا ئەمەشە حیکمەتی چرا هەڵواسراوەکانی
گۆشەو کونجان
کە بە شەرمەوە هەڵدایسێن..

**2004/11/28**



## (52)

ئەوە بەدبەختیە
کە تۆ بە بەختیارێکی بێ وێنەی دەبینی..
ڕێچکەیەکی ئاڵۆزە، هەنگاوە لەرزۆکەکانت
خستۆتە سەری
وەهمێک شک نابەی
بەرەو ئاسۆیەکت ببا
بەدبەختیە، بەختیاری نییە

که تونێڵە تاریکەکان جێ دێڵێ و
دەستت لە پرچت دەگێڕی
وەک ئەوەی لە کۆستێکدابیت
ئەوەتا دەبینی
ئەوە ڕووبارە
وێڕای بەدبەختیی
ئەوە ڕووبارە بە ستراتیژیای پاکبوونەوە دەڕوا..



ئاوازی شەیدای ڕۆشنایی نوور
چرپەی فێنکی دارستانن..
کەتژی خۆشی و کامەرانییە
ئەوەی هەرگیز، هەرگیز تۆ تێی ناگەی
پشیلەی فێڵباز!

**2004/12/5**






**(53)**

ئەوە مەملەکەتی منە،
نیشتیمانێک بە ئەستێرەی باڵدار گەشاوەتەوە
ئەی پاسەوانی ئاوێنە!
ئەوە مەملەکەتی منە..
ئەوەندەی شەو بە دڵی دانیشتووانیدا ماندووە
چیمان لە سرووتی ڕۆح، چیمان دەست کەوت
پاسەوانی ئاوێنە!
چیمان لە سووتانی زستان و بێڵایی شەوق دەسکەوت..
چی؟

چیمان لە هاوکێشە لاسەنگەکان و
سەیرکردنی ئاوێنەدا درویەوە؟
فرمێسکەکانمان گەرماییان لە سۆزی کانیاوەکانەوە
وەرگرتووە..
سێبەری داڵانەکانی مێژوویش لە جوگرافیای ماندوودا
چەند هێماییێکن سیحرو تۆقاندنیان بەرجەستە کرد
هەورەکان نزمن



تەنیاییەکە بۆرەپیاوان تێی ناگەن
ئەوانەی کاتیان
بەو شتانە بەسەر دەبەن
کە کەسانی دی فڕێی دەدەن
ئینجا بۆچی سەرسوڕمان لە پای چی هاوڕێ؟!
بۆچی سەرسوڕمان..؟
کە تۆ بەدزیەوە هاتیە ناو داڵانەکانی دڵم..
شار بوو بە بەردێکی لاڵ
میری مەیخانەو
پاڵەوانانی شەوانی سوور، خلۆری دەکەنەوە...

تەنیاییەک بۆرەپیاوان تێی ناگەن
ئەوە تەنیایی منە..
سەرگەردانیەک «زانایانی تاریکی»
سەرگەردانیی منە.. پەی پێ نابەن
شوورەی شەوق و ناکاویان
تەنها ئەوانە دەتوانن لێی بپەڕنەوە
کە بە عەشق و ئەبەدیەت و
گۆرانی جودابوونەوە چەکدارن...
ئەوە مەملەکەتی منە، پاسەوانی ئاوێنە!

**2004/12/12**



## (54)

**هاوڕێ و گوڵ و ئەستێرە**
**هاوڕێ و گوڵ و ئەستێرە نین**
**ئەگەر هاوڕێ و گوڵ و ئەستێرەیان تێدا نەبینی.**

**شاعیرێکی ئەرجەنتینی**
**ئەنیتۆو نیو بۆرکیا**

تۆ لە کوێی خۆشەویستیش لەوێیە
لە برادەران، لە سێبەرێکی کز بەدەر هیچیان نەمان

که له نادیدەدا دەدەرەوشێنەوە
هاوڕێی ئیتر مانای پەنجە نابەخشێ
که دەستیان بەسەر ژێیەکانی دڵدا دەهێنا
یا ئەو موژدەیەی
هەر کاتێک دەردەکەوت
خەندەی له سیمایاندا دەکێشا...
برادەر لەم سەردەمەدا



له زڵکاو دەکا
چەند بەهێزتر دەستی بگوشی
بەهێزێکی پترەوە نقومت دەکا..
گوڵیش وای لێهاتووە
بە دڕک خۆی دەپارێزێ
ئەستێرەکانیش قیبلەنمای بۆش دیاریان دەکا
ئەستێرەکان
شوێنەوارێکیان نەماوە بیانبینی
چ جای ئەوەی
شتێکیان لێ بدۆزیەوە
ئای داخی گرانم.. هاوڕێ..!

**2005/12/19**

**(55)**

له چاوەکانتدا پەرت بووم
ناتوانم خۆم کۆبکەمەو
منی وەبەر سەرگەڕانیی کەوتوو، بە «وەجد» داچوو..
شەوێکی کەزیدار بوو
لە پشتەوەی ئاسۆیەکی ئەرخەوانی
وەک خەرمانەیەک دەرکەوت
لە ناوێکدا سەعات و دەقە و ساتە بارگاویەکانی ڕفاندم
لە سرووتێکی بێ کۆتاییدا پەرتی کردم



نەمدەتوانی جیاوازی لە نێوان چاوەکانت و
کریستاڵە هەڵواسراوەکان بکەم!!
ئەمانە دەرکەوتەی نەناسراوێک بوون
کە لە دنیادا حاڵی نییە
تەنها تیری نیگاو
مەملەکەتی چاو و
شەپۆلی کەزیە بکوژەکان نەبێ.



چەند ئاسانە لە تاریکدا چرایەک گڕدەی
چەند گرانیشە شەوە ڕووناکەکان
ڕۆشن کەیتەوە
شەوێکیان بوو بە نوورو وڵاتی نووری ڕووناک کردەوە
لە پاشاندا پەرتی کردم
تا ئێستا نەمتوانیوە خۆم کۆکەمەوە..

**2004/12/26**

**(56)**

شەپۆل خۆی بە تەنیایی خۆیدا دەدا..
پەردەکان لادە بتبینم
ناکاو ئەو دڕکانەم دێنە پێش
کە هەڵاڵەی گوڵانیان دزیوەو
خۆیان بە باخچەی هەڵواسراو داناوە..
تەنیایی دڵی شەکەت کردووە..
ئەی شەوگار!
ئەی ئاسایی و لە بەردەستان..



تەنیایی دەرەوشانەوەی لێ ون کردووە..
پەپوولەیەک نە نشینگەو نە ئاسمانێکی هەیە
کەناری ڕۆحی پارچە پارچەم نەبێ..
پارچەی وا، لەگەڵ هۆرەی پێ پەتی و
ئاوازە ڕەنگاو ڕەنگەکان هەڵدەفرن..
نوزانەوەم لە دەوروپشـــتی دەم و چاوە هەڵبــزرکـاوەکـان
باڵەفڕێیانە
ئەمانە نزای خواحافیزین..
دەبێ خۆمان بدەینە دەست چاوە خەواڵووەکان

موجیزە ئەوەیە تا دوا هەناسە بە عاشقی بمێنینەوە
نەبە تەنیا خۆ بنوێنین و هیچیتر..
هەندێ شت هەیە دەڕۆن
هەندێکی دی دەمێننەوە..
تۆیش هەڵبژێرە!
هەڵبژێرە چارۆگەی «کەشتیەکەم» ،
ئەی ئاوازە بێدەنگەکەم! هەڵبژێرە!



ڕۆژگار خەریکە دەگوزەرێ، بەسەر دەچێ..
لێ ڕامینە! تەماشام بکە!
ئاخر سەیرو تەماشایش باخچەو کەناری هەیە
تەماشام کە!
چەندی تێتدایە تەماشام کە!
ئەی ئەو خەرمانەیەی چاوەکانتماندووکردووم و
یادەوەریەکانت دزیوم..

**2005/1/2**

## (57)

ڕێگام لێ بووەتە چۆڵەوانی
ژاوەژاوێکی قورس بە جریوەجریوی چۆلەکان
سپێدە گوزەر بە یادەوەریەکاندا دەکات
گوڵ چوونەتە بازنەی باوێشکەوە
بە گەوهەرەکانی تاراوگە گەوهەر بارانت دەکەم
کۆست، دڕکی غەوارانی لەسەرەڕێدا
لە بێخەوە هەڵکێشا..



بەدبەختیەکە نەبێتەوە
لە هەیڤەوە بڵاودەبنەوە
ژەنگی بەربەست و ناڵەناڵی ئەستێران
چاوەدێریمان دەکەن..
لە خەونێک هەڵم مەستێنە
کە تینوویەتی لە ناسەقامگیریدا دەشکێنێ..
مەگری لە کاتێکدا سرووتەکانت لەگەڵ گوناهان
لەبەریەکڕادەچن..






هەستەوەو جانتات بپێچەوە
لە نێو قەرەباڵغیدا سەرهەڵگرە!
بە ڕووتی و پێ پەتی و پڕ بوون.
هەستەوە!
بۆن و برینگ کوچەو کۆڵانی پڕ کردووە
لە خەونێک هەڵم مەستێنە..!
کە مۆتەکەکان ناتوانن بیخنکێنن
جیهانیش سیمای گۆڕاوی خۆی هەیە
دەبێ خۆبدەینەوە دەست دانایی پەپوولەیەک

کاتێک بەسەر گوڵەکاندا دێ و دەڕواو
بەرەو ڕووناکی پەلکێشی دەکات
بەرەو ئاشکرابوون..
ڕێگام لێ بووەتە چۆڵەوانی
ژێیەک دڕک یاری پێدەکەن..
ئەمە ئاواز نییە
ئەمە دڵەکوتێی لاوانەوەو



مەشخەڵی نوورە..
ماندوویەتی و لاوازیی تینی بۆ هێناوە..
ئەمە گەشتێکی لەبیرکراوە
لە کەناری لازووەردیدا دەبریسکێتەوە..
بەم جۆرە جارێکی دی
دەست بە گەشتەکەم دەکەمەوە
بە ڕووتی، بەپێ خواسی و بە پڕی و
بە خۆدانە دەست حیکمەتی پەپوولەیەک...

**2005/1/9**

**(58)**

وەکو بڵێی دەنگمان بەردەوام خامۆش دەکرێ
مانگ لە دوای مانگ
ساڵ دوای ساڵ
گۆتەی پووچ
هێماکان دەیلێینەوە



کە تەنها کوشتنی تیشک دەزانن
تەنها بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیری کامەرانیەکی درۆیین
تووشمان بوو بە تووشیانەوە
بە بۆنی بۆگەنیان
بە کرێگەتە بستەکۆڵەکانیان
بەم جۆرەش هەروەک دەڵێن
خۆر بە بێژنگ ناگیرێ
لە پڕێکدا بای ئازادی

خۆی بە کونجە تاریکاکاندا کرد
وێڕای تێکدان و وێرانکردن
وێڕای ئەنفال و ڕاگواستن و بەعەرەبەکردن و
بەعسی کردن
بە عاشقیماینەوە
سەیری ئاسۆ دەکەین
هەروەکو چۆن بە چەکە ترسناکەکانیان
ڕۆژانە دەیانکوشتین
ئێمە بە چۆرێک ئازادی ڕەشمان کردنەوە..

**2005/1/30**



## (59)

سەرسوڕهێنەرە ئەم ژیانە
کاتێ خەم و فرمێسکان دەپۆشێ
سەرسوڕهێنە ئەم دەسماڵە
کە برینە کۆنەکان لە خۆ دەگرێ

تیشکێک لە جەستە بە زمان هاتووەکاندا هەڵدەقوڵێ
جەستەیەک ساچمەی ساڵانی هەڵگرتووە
فرمێسک پێشوازی لە گلێنە مەستەکانم کردو
لە دیدارێکی  دۆستانەدا
باسیان لە گریانی هەوران و
سیمای هەڵبزرکاوی غەریبان و
دەرکەوتنی ڕەنگی گوڵانیان لە ڕۆژێکی خۆرەتاودا..
داخۆ مافی ئەوەمان پێ دەدرێ



لەودیوی هەواڵەکانەوە
خەون بەنیشتیمانێک ببینین؟
داخۆ مافی ئەوەمان هەیە موجیزان بگرین؟
بەڕاستی ئەم چاوانە سەرسوڕهێنەرن
کە تەلیسمان دەشکێنن و
عەزیمەتان بە نوێژی نیوەڕۆیێ تیرۆر دەکەن
ئەم بۆنی سەردەمە
بە هەموو ئەو شێواندن و بێهودەیەی تێیدایە
جا خۆمانی لێ دەشێرینەوە..
بە خودای ئەمە تەنها بایەکە کە بەنێو تۆڕدا ڕەت دەبێ و
هیچیتر...

**2005/2/6**

**(60)**

دەشێ تۆز وگەرد لە هەرای شەوانی سوورەوە هاتبێ
جەنگێک بوو ، بۆنی نهێنییەکانی لێدەهات
سەدایەک لەگەڵ باڵی نەورەسە ماندووەکاندا دەفڕی
دەبا باوەش بە گۆشەگیری و دوورەپەرێزیدا بکەین
بنەوشەیش
بڕیاریدا باخچەو مێرگان بەجێبێڵێ





هەموو هەوڵ دەدەن دنیا كۆبكەنەوەو
بە مێژوو و جوگرافیاوە لە گیرفانیانی بپەستن
ئێستا «ڕەنگە» و «لەوانەیە» بۆتە ڕاستیەكی زەق
كۆڵان و جادان تەی دەكا..
جادە بە جادە
كۆڵان بە كۆڵان
ئەوەی بێتە پێشی پێی پیا دەنێ



خۆشەویستیت شێوێندراوە.. شێوێندراوە
بۆچی چاوەكانت پشت گوێ خستووەو
لێی گەڕاوی بە نیانیەكی پووچەوە تیرۆر بكرێن
بەسە شێوێنەری درۆزن .. بەسە!
ئیتر ناهێڵم تۆزی
شەوە سوورە بە ژاوەژاوەكان
میزاجم تێك بدەن..

**2005/3/13**

**(61)**

شاش مەڕۆ بمانەوێ و نەمانەوێ
چووینە ڕۆژگارێکی دی
چۆن چاو بنووقێنین.. شەکەت
چاکتر وایە بۆ من و بۆ تۆش
شێوازەکە بگۆڕین
ئێمەش گیرۆدەی ئەستێرەکانین و



هەواداریمان خۆش دەوێ و
عاشقین..
ئێمە دەمانەوێ شتە بە مرۆبووەکان
بە مرۆڤ بکەین
چیتر...؟
تۆ سەرەتا ، هی خۆت بوو
من هەڵخەڵەتاو بووم بە تۆ..
ئەمە هەقایەتێکی دیکەیە

گەر بەشداری تەنیاییم نەکەی
منیش هاوبەشی تەناییت نابم
ئەگەر ڕاست دەکەی با بەردەوام بین
لە ڕێگادا لێژایی و
هێلّی وای تێدایە، لێک نادرێنەوە...
بۆت نادرکێنم چیم لەگەلّتدا هەیە
ئەمە هەقایەتێکی جیاوازە
دەبێ خەونەکان بەدی بێنین
هەر دەبێ خەون بەدی بێت، چارنییە..

**2005/2/20**



## (62)

تا ئێستاش کلیلیان لە گۆشەیەک فڕێ داوە..
لە نێو تەمومژدا دەبریسکێتەوە
ئازارکوتی خەونبین
ئازارکوت لە تیۆرو تیوراندن و
قالّبە ئامادەکان بێزاربووە..
ئازارکوتی خەونبین لە ئاوێنە فێلّبازەکان... بێزارە..





چەند کەسێک بوون
ئێستا بوونەتە سوپایەک لە داهێنەرانی ڕق و کینە
لەوانەی خۆیان لە چڵپاودا حەشارداوەو
وەک شەمشەمەکوێرە ڕوناهی
چاوی دەرپەڕیوی ڕقاوییاوی کوێر کردوون
دەنگیان بە هاوار هاوار گڕبووە.

ڕۆژێک چەشەیان لە خەو نەبینیوەو
باوەشیان بە ڕێژنەی بارانێکدا نەکردووە
وایان دێتە بەرچاو ڕوو لە هەورازن
ڕاستە ئەوان ڕوویان لە هەورازە..
بەڵام بەرەو خوار سەردەکەون
تۆڕی وا دەچنن



جاڵجاڵۆکە سەری لێ دەرناکەن..
خەم بۆ ڕەنگی زەردی مانگ ناخۆن
ئەستێرە گەشەکانی ئاسمانیش دڵخۆشیان ناکا
ئەوانە گورگن لەبەرگی مرۆڤدا
هاوڕێیان
باشتێک بکەین
نابێ لێ بگەڕێین گورگ سەربکەون.

**2005/2/27**

## (63)

ئاخری لە بەندەرەکەیدا لەنگەرم گرت
منی کەشتیی
لە شارێکی پەرژینکراو بە خۆشەویستی و
بە داری تامەزۆریی..
لێی گەڕام
بە ساچمە بکوژەکانی یادەوەری بمکوژێ
بەڵام گەر تۆش لە جێی من بای
چیت دەکرد..؟



ئەوپەری نەبوو..
ئەو لە زلّکاودا نقوم بوو
هاواری بۆ ئەو لێشاوانە دەبرد
کە لە بێئاگایی ڕۆژگاردا هاتبوون.. بێ هوودە..
ئەو لێشاوانە خلۆریان دەکردەوەو
پێچیان بەجستەی دەدا
بە خۆشەویستی تێنوێتی ناشکێ
خۆی بە میرە ژنی بەندەرە بە ژاوەژاوەکان داناوەو
ون بوو..و لێچووەوە..

**2005/2/6**

## (64)

چۆن بووی هەروابە!
ئاخر زۆربەی پیاوان لە پیشەسازی فریودان
لەسەرسوڕمان زیاتر نازانن...
پاشی ئەوەی ڕۆیی
چۆن بووی هەروا بە!



لە بەردەم ئاوێنەدا گەمە دەکاو
تاخوا دەڵێ بەس، یاریان پێ دەکا
چرایەکی هەڵواسراو خەو لە چاویان دەتۆرێنێ
لەگەڵ ئەوەشدا
وەکو خانمێکی قدیس لە هەواڵەکان دەردەکەوێ
بە عەترو بخور دەست نوێژ دەشوا
بەڵام لە ڕاستیدا ئەو
جەستەیەکە بە وەرزەکان تێر نابێ

چۆن بووی هەروا بە!.
بۆچی وانەبی؟!
مەودایەک لە نێوان هاوارو گۆرانیدا..
لە نێوان ساوی ئاوریشم و ساوی تێلدڕدا.. نەماوە!
چۆن بووی هەروا بە!
ئەی ئافرەتی گەمەباز
کە بە پۆشاکی  پەرییان خۆت دەنوێنی...

**2005/3/13**



**(65)**

نەغـمـەیەک لەم بەهارە پێشـوەخـتـەدا باوەش بە ڕۆحـمـدا ئەکا..
یادەوەری منداڵی.. و دەنگدانەوەی بنەوش
چیت لە هەورێکی ئاوتێگەڕاو دەوێ
کە لە ئاسۆڕا دیارە..
شکستێکی جوان و خۆ بە دەستەوەدانێکی جوانتر
کاتێک گوڵەکان لەو دڵۆپە ئاوانە دەپارێنەوە

لەوەی لە ڕێیاندا دەیان پرژێنێ
دڵ لەو مەمکانە نزیک بوو
کە گەردوون دەشارنەوە
لەسەرخۆ ئەی ئەو شازادەیەی
میرنیشینەکەی لە دەست چووە.. لەسەرخۆ!
ئەو ئێوارەیە بە کراسێک قورس بووە
شایانی دڕکەڵانیش نییە..





بە گوناهێک لە خەیاڵاندا نەبوو
ئازارێکی گەرمم بە دەماراندا دەڕوا
ئاسۆیەک وێنەی سەراب.. بێ ڕوانگە
نەغمەیەکی فریودەر
ڕۆحم لە ئامێز دەگرێ.
لە ئێستاوە ئیتر منداڵی لای من شتێک ناگەیێنێ.
چیتر خەمی منداڵیم نییە
شازادەی ساختە..

**2005/3/20**



**(66 )**

ئەوەندەی ناوی تۆیان هێنا
پیتەکانم پەرش و بڵاوبوونەوە
هەمووم لە تۆدا توایەوە
ڕۆژهەڵاتم.. ڕۆژئاوام
باکوورم.. باشوورم

ئەرێ کـــاتی باوەش بەیەکـــدا کـــردن، ســـووتان..
نەهاتووە؟...
ئەی ئافرەتە سەوزەکە.. ئافرەتی حەربا
سپێدە خۆی لە بانیژەکەم دەسوێ
گوڵە زونبووقەیەک تازە دەمی کردۆتەوە..
نەخشەیەکی تازە بکێشێ..
بۆ نیشتیمانێک بە هەناسەبڕکێوە



بەسەر ڕووتدا دەڕوانێ..
فرمێسکێکیش لەسەر ڕوومەتتدا ڕاکشاوە
چەند سرووتێک بوون بە ناچاری جێمان هێشتن
چەند ماچێک لە نێو ترسدا مت بوون
بە فرمێسک پیرۆزم کە! تا بکوژێمەوە..
من بە شێوەو ناوەرۆکەوە دەسووتێم
ساتێکە لە هەڵاتندا ئەی حەربا..!
کە شەوگار بە تاریکیەوە بەسەر جێگەماندا دەدا
ئای کە ساتێکی گەرمۆکەیە
کاتێک تەسلیمی سێوی گوناه دەبین.

**2005/4/3**

**(67)**

بێدەنگی وای لێهات بچێتە ڕیزی شتە دەگمەنەکانەوە
ئازاری خۆلێکسوین
ڕۆژگاری دێرینمان دێنێتەوە یاد
ڕۆژگاری دەسماڵ و نهێنی ماچی شەرمن
کە تێکڕای گەردوونی گڕدەدا
ئیتر سپێدە فریامان ناکەوێ..
لە ڕۆژگارێکدا



گوڵەگەنمەکان لە ترسا دەلەرزن و
ئاسمان لە عەشقدا دەگری..
سیمای تۆ
لەگەڵ ڕووناییدا دەردەکەوێ
کە لە شارە پێخواسەکاندا هاتووە
سرووتەکان لەو کەنارانە دەچن



ڕووبار جێدەهێڵن..
شادیش بەسەر چەند پەڵەیەک ڕاکشاوە
هەناسەسواران
لە زبڵدانی مێژوو جوگرافیادا کۆیان کردۆتەوە.
من بۆی دەردەچم..
باڵدەگرم..
با مۆم لەسەر تەپۆلکەکاندا پێبکەین..

زەوی شەوگار دەپۆشێ
مەمکی تۆش، بە ئاهەنگی ئاخان دەلەنگێنەوە
پێخەفێکی خاڵی
خشەخشی گەڵای تێدا گڕ دەگرێ..
خامۆشیی شەوگارو
فرمێسک چەند هەنگاوێک لە دوور ئێمەوە دەڕژێن
ناکاو
هەست بە خۆمان دەکەین کوژاوینەتەوە..

**2005/4/10**



## (68)

وێڕای تاریکستانی داخ لە دڵان و
بێژینگی فێڵبازان.. خۆرێک هەیە سەرمان بۆ هەڵدەبڕێ
خۆرێک گوڵەگەنمەکان لە خەو هەڵدەستێنێ و
تابلۆکان لە چوارچێوە دەردێنێ..
تاکو شکست خواردو و سەرکەوتووان

ترسنۆک و ئازاکان.. دەربخا....
ئەی خۆری تەنیام!
بمکەرەوە منداڵ.. بمگەڕێنەوە بێشکە
تا جارێکی دی لە کلاورۆژنەی ماڵمانەوە بتبینمەوە..
تۆزو گەردێک سەمادەکا و
شەوگار دەسڕێتەوە...
ئەی خۆرەکەم!
ئەی ئەو خرۆکەیەی بە نیشتیمان دەچێ و



به دیماهی نەهاتووەوە نووساوە
تونێڵ هەیە
هەزار بە هەزار پڕ لە نهێنی و
تژی شوێن پێ.. ماندوومان دەکا..
ئیتر تینمان تێدا نەماوە بیانسڕینەوە
ئەی خۆرەکەم!
لە ڕووخسارێک هەڵدێراوە و یادەوەریەک
بە گوشین دەمگوشێ و

رووناییەک خەواڵوویی ڕاوی دەنێ
هانا بۆ تۆ دەهێنم ..
ئەی خۆرەکەم !
ئەمانە چەند وەرزێکن پێش ڕۆژگاری خۆیان کەوتوون
ئەی خۆرەکەم!
ئەی ئەو سێڵەی بە نیشتیمان و
چاوی خۆشەویستەکەم دەچێ...

**2005/4/17**



## (69)

تژی فرت و فێڵ
لە زڵکاودا ڕۆچوو
کراسی کچێنی لەبەر کردووەو
دەچێتە نێو شارێک
کەوتۆتە ژێر قامچی جەنگ و بازرگانی
خەریکە خۆی لە پیرییەتی دەوروبەری بسوێ..
پرچێکی بۆیەکراو

برژانگی دروستکراو
لێوی ئەستوور کراو
کە لێوارەکانی بە بۆیە دیاریکراوە
ڕووخسارێکی ون..
بەڕاستی دەدرەوشێتەوە..
بەڵام وەک گوڵی دەستکرد
لە نێو فرتوفێڵدا پیربووە
منداڵی فڕێی داوەتەوە کەندەڵانان
ئەفسانەیش لە ژماردن نایەن



بەرگی کچێنیش پێویستی بە پینەکردن هەیە
خانم هەر خۆی پێویستی بە پینەکردن هەیە..
کەواتە با بەسەرمەستی زەردەپەڕو لێوارەکانی ئاسۆو
ون بوونی مانگ ڕابوێرین..
با بە گرانی خۆمان ڕابوێرین و
پڕ بە سییەکانمان هەناسە بدەین
لە نێو مەملەکەتی مەمکی هاوبەش بۆ هەمووان..
پڕ بە دەممانیش هاوار بکەین
بژی مەمک
بژی گەڕانەوە بۆ خاک و کچێنی خاک و
ڕوونایی لە ئاوێنەدا هەڵاتوو..

**2005/4/24**



## (70)

خەوبین بەڕەهاییەوە
ڕوخسارە شکست خواردووەکانی نایاتەوە یاد
کە هەمیشە لە بەخشندەیی خەمی تیشاوێژەوە هەڵدێن..
وەک مانگ بە تریفەی
درەخت و گیا دادەپۆشێ..
خەوبین بە ڕەهاییەوە،

نە هەژموونی ساتە درۆزنەکان، لە ئامێز دەگرێ
نە جۆشی مێگەل لە پێکداهاتنیاندا
دواجار زانیم.
کوێرەڕوانینە شینە سێرەگرەکانت لە کوێدا هەڵدەکەن
زانیم چۆن دەنگت لێدەچێتەوە..
کاتێک دەچیە نێو دارستانی گوناهەوە..



فرمێسکێک ڕژا..
تا بیخەیتە چاوتەوە
چاویش بخەیتە جۆگەو
جۆگە بخەیتە ڕووبارەوە..
ئەی دەریا باوێیتە کوێ؟
دەریا خۆی بە چیدا بدا؟
ئەی بەدڕەفتار!
کە لە بۆنی ئاگر و شڵپە شڵپی لێشاو و سووتانی

پەپوولانەوە هاتووی
لە دۆڵی وادا هیچیان لێ شین نابێ..
چەند دێرێک خەونبینان نەخشی دەکەن
تەنانەت لەسەر ئاویش
چەند سرووتێک دەگوترێن
لێم گەڕێ با لەگەڵ خەمی جوان و
ئازارە شیرینەکانمدا بژیم..
کە لە هیچ شتێک ناکات
لە تاڵە تیشکان نەبێ..
لەو کاتەی یادی بەخێر
لە ڕەهایی خۆشەویستیمان دەکاتەوە
کە لە خۆی زیاتر بە هیچ ناچێ..

**2005/5/1**



## (71)

دەنگ باڵا ، ڕووەو قووڵایی ئاسمان بەرزبوونەوە
خوێن ئاسۆ ڕەنگ دەکا
ئەوە منم ڕۆڵەت.. شەپۆلی چۆلپەرستان
جار ناجار هەڵیدەلووشێ..
ئەوە منم هەولێر.
ئەی پشت و پەنا..
ئەوان دەیانەوێ مێژوو لە هەموو شتێ دابماڵن

شەقامی دڵان دابخەن
کە بەو هەنگاوانە ماندوو بوون
لە نێو باڵی تاریکیدا جێوەڕێیانە..
مۆڵگەی بە ژاوەژاوی گەوادان و
پێخەفەکانیان بۆگەنی لێ دێ..
ئای هەولێر
ئەی ئەو شارەی مێژوو
بە پۆلی پەپوولەو
هەورازونشێوانی ڕەنگڕێژ کردووە،



گەلەگورک هێشتا
لەگەڵ خەوناندا لە ژوان دان..
وێڕای کینەی داخ لە دڵان
خەون چارنییە دێتە دی..
شتێک لە ئاڵتوونی خۆرو
زیوی مانگ دەخوازم
تا ئاسمان و زەویی بەخێروبێرت ڕەنگ بکەم و
لەوانەشت بپارێزم نایانەوێ
وەکو شار بتبینن....
کە گەرمی و خۆشەویستی دەبەخشێ و
خراپکاران شکست پێ دێنێ
ئەوانەی لە چڵپاودا نقوم بوون.

**2005/5/8**





**(72)**

شەرێک لە نێوان باڵی نەورەسەکاندا بوو
هاورێکەم وای دەگووت
لە کاتێکدا وەسفی برژانگە تەڕبووەکانی دەکرد
بە فرمێسکی تیمساح
وەرزەکان موژدەی گەڕانەوەی خانمی پیرۆزتان پێ نییە
پروشەیەک لە بۆن

بەسەر هەورە کۆچەریەکاندا ڕاکشاوە
بۆن، دەبینرێ.. بۆن ناکرێ
هەروەک دەزانی سەردەم، سەردەمی بینینە..
شتگەلێک دەبینین، بۆن دەکران..
هی دیکەش بۆنیان دەکەین، دەبینران..
ئێستە زانیم چی لە شەوێکی ساردا نوقمی کردووی
نوقمی کردووی و



بە دزیەوە ماچی تەنگەتاوت دەبرد
ئێستە تێگەیشتم
بۆچی ماندووی؟
خۆت بۆ چەند ..... داوێیە باوەشانەوە،
کەچی هیچ لە مانای ئامێز ناگەی
چ زەمانێکی بێ ئەمەکە، ئەم ڕۆژگارەی ئێمە
لە ئاسۆکەیدا پەیکەرێکی هەڵکۆڵدراو لەگەردو

لەڕوونایی پێکەوە
ئای کە سەیرە!
ئەم رۆژگارە بێ ئەمەکەی ئێمە
لە تێکشانێکەوە بۆ تێکشکانێکی دیکە دەمان هێنێ و
دەمان با..
ئەی پشیلەی دەسباز...

**2005/5/15**



**(73)**

والآبوون/ درکاندن
دڵ بۆ یەکتر کردنەوە چیتر بە کەڵکی ڕووبار نایەت
کە لە سەر ڕێگەکاندا نەخش کراوەو
هاوتەریب لەگەڵیدا ڕێ دەکا
هەموو ئەوەی دەریا توڕیان دەدا
لە گوێپێدان زیاتر نییە.
شتێکیش لە نیاز

که درۆکاری ماندووی کردوون!
له مرۆوه چیتر بیرت لێ ناکەمەوە
ڕووباریش بێ بیرکردنەوە ڕێ دەگرێ
ئەوەی بیر لەوە بکاتەوە بە هاواری درەختی کەناران و
هانای ماسیە شێتەکانەوە بێت
سەرسوڕمان!!
ئەو لێشاوەی لە نادیارەوە هاتووە
ئینجا سەرسوڕمان بە کەڵکی چیمان دێ!



ئێمە کە بێگەردیمان بەجێهێشت
چۆن بە نیازی گۆتان دەگەین
کە سەدای خۆیان بەجێ هێشتووە..
هەواڵەکان وا دەگەیێنن
ڕووبار هێشتا هاوتەریب
بە نەخشەکێشراوی سەر ڕێگا بەڕێوەیە
ڕێگا ئاماژە بە نادیارو ئارەزووی نەمرییە




وەک حەزێک کە لە مانا دیارو نادیارەکانیدا
لە ڕۆژێکی خۆرەتاو دەچێ..
دەستم لە بازنەکە سوی
وێڕای ڕێکردنی ڕووبارو
هاواری پنجەداران
هاواری ماسیەکانم بیست..

**2005/5/22**

**(74)**

کات ئاراستەی خۆی هەیە
شوێنیش ئاراستەی خۆی..
هەنگاوەکانی بە تاو نین
ئەویش لەو سەرجێیەوە بۆ ئەو سەرجێ
خەیاڵی وایە بەلای خۆشەویستیدا دەچێ
گەواد بە هەموو جۆرەکانیانەوە
کۆبوونەتەوە ڕێگاکان بگرن
جەستەش ماندوو



دڵیش
مەپرسە..
بە درێژایی ڕۆژگارێ دەسووتێ
قەبارەی شوێن..
جەنگێک بوو
جەنگێک کە بە هیچ جەنگێکی بەرپاکراوی
سەر ڕووی ڕەنگ سپێدەو

**(74)**

کات ئاراستەی خۆی هەیە
شوێنیش ئاراستەی خۆی..
هەنگاوەکانی بە تاو نین
ئەویش لەو سەرجێیەوە بۆ ئەو سەرجێ
خەیاڵی وایە بەلای خۆشەویستیدا دەچێ
گەواد بە هەموو جۆرەکانیانەوە
کۆبوونەتەوە ڕێگاکان بگرن
جەستەش ماندوو



دڵیش
مەپرسە..
بە درێژایی ڕۆژگارێ دەسووتێ
قەبارەی شوێن..
جەنگێک بوو
جەنگێک کە بە هیچ جەنگێکی بەرپاکراوی
سەر ڕووی ڕەنگ سپێدەو

تیشکدانەوەکانی شەوی بنەوشەیی نەدەچوو
ئەمە جەنگی هەنگاو و ئاراستەکانە
جەنگی بەر دەست کەوتن و
یاری کردنە بە نەناسراوان
کە وەهمی جاویدانی شێوێندراوی تێدا چاوەڕوانە
گلگامێش تا ئێستا لە خەونەکانی ئەنکیدۆدا
ئازار دەچێژێ..
کە لەسەر شۆستەکانی «ئوور»و
مەیخانەکانی «لەگەش»دا جێ هێڵدراون..



چیت بە چنگ کەوت ئەی جنۆکە فێڵبازەکە
پاش ئەوەی دڵت بەجێ هێشتم
چیت دەستکەوت؟
پاش ئەوەی وەکو ژنێکی پیرۆز
خۆت دایە دەستی گورگانەوە؟
لە دوایشدا وەکو کولانەیەکی لا چەپ بەجێیان هێشتی
کە هەموو ڕێبوارێک لێی دەچێتە ژوورەوە
بەشارەزایی بێ یا بێ شارەزایی
چیت دەست کەوت کە تۆ هێشتا لە شوێنکاتدا
بەڵەد نیت...

**2005/5/29**

**(75)**

نەسیم هەڵدایسێ و
نوور هەڵدەکا..
ژیانیش بەبێ ڕوانگە
لەگەڵ هەژموونی سواڵکردنی پۆست مۆدرێنیتەدا
سواڵکردن، تەنانەت لە خۆشەویستی و ڕقدا
ئەوەتا بازاڕەکانیان تەنیوەتەوە
تا ئازارەکانی ڕۆژگاری پێ داپۆشرێ
نادیاران بە دوای خۆیدا بەجێبێڵێ..



مەمکی وای تێدا دەلەرێنەوە
ئێستاش موژدەی بەهارێکی دییان پێیە..
پەنجەرەکان داخراون
هۆزگەلێکیش کە خەریکی دروست کردنی تاریکین
لە گۆشەیەکدا نیشتەجێن
لە هەموو شتێک داماڵدراوە
ڕۆژگارێکی نوێ بێگومان دێت
کە خەریکە ئێمە بە زۆری بچینە ناویەوە






کەچی خەڵکی تر خەریکن بەجێی دێڵن..
کۆمپانیای بەرهەمهێنانی وەهمیش
خاوەنی لێپرسراویەتی بێ سنوور
ئیدی لە کوێوە نەسیم هەڵدەکا
بە چ ئاراستەیەک ڕووناکی تیشک داوێ
کە شەوق
بە ڕق و فێڵ دەورە دراوە؟!
ئای هاوڕێکەم!
ئەسەف
ئازارەکانی ڕۆژگار هەند زۆرن، لە ژماردن نایەن...

**2005/6/6**

**(76)**

خەیاڵی خەم بکە
کە بە پارکەکاندا دەسوڕێتەوەو
سەمادەکاو وێنەی باران دادەکا...
خەیاڵی هەوری بەهاران بکە
کە بەسەرسڕمانەوە وێڵە
خەیاڵی ڕوانینان بکە..
سەداگەلێک چرپەو خەمی هەڵگرتووەو



هەنگاو بۆ کۆکردنەوەی دڵە وێڵەکان دەنێ
کە بوون بە پەنای فێڵ و درۆکاری
ئاماژەگەلێک لە ئاوێنەمدا ڕەنگی دەدایەوە
تەماشا!
ئەوە منم لەو شەڕە نابەرابەرەدا
دان بە شکستی خۆمدا دەنێم
باهۆز،
کە لە بێگەردی بەرزاییەکانی بەرائەتدا هاتووە

له بەرامبەر بەرزی و نزمی خۆحەشاریی و گۆشەگیریە..
ژوانە گومانلێکراوە هەقدراوەکانیش
لە تاریکیدان..
ئەی ئەوەی نوقمی ژەهری جێخەوانی و
چاوونووقاو بۆ چرنۆکی بتە ئادەمیەکان
کە داندراون سەرەتایان دوایی پێ بێنن و
خەم و خەفەتان بە شەقام و باخچان بڵاوبکەنەوە..

**2006/5/31**



## (77)

کەف و کوڵ
وەکو جاران ڕاپێچی نەدام
وەک چۆن جاران دەیبردم
هەر کاتێ دەتبینم کەزییەکی شۆڕی
ڕۆحم دەسوی
خەمی چەندین ساڵەت لەبەرکردم
کە پۆلەمەلی کۆچەر

وەحشەتی جیابوونەوە حوکمی تێدا  دەکا
تێکشکان.. چەپڵە نەکوتان..
تۆ خۆت بینیوە؟
وەکو من دەتبینم..؟
تۆ ڕووتی..
ڕەوی هەوەسبازان ڕیزیان بۆت بەستووە
من هەموو شتێکم بۆ ڕوون بووەوە
هەموو شتێکم بینی



دارستانی گوناھ
باڵی ئامێزی درۆیین
لە پێناوی.........
چیای غەدەر
بۆ هەر کوێیەک بچی لەگەڵتدایە
ئەمجارەیان کوڵ لەگەڵ خۆی نەبردم
تۆم بینی ڕوویەکی تێکشاوبووی، هەڵدەهاتی
هەنگاوەکانت تێکدەئاڵان..
کاتی ئەوە هاتووە نامەکانت لە حەشارگە دەربهێنم
تا لۆچەکانی ڕۆحت دەرکەوێ
ئینجا بۆ نا؟
زەردەخەنەو وشەکانت برینداركردم
چیتر ماوە بیکەی .. درۆزن.

**2005/6/21**





**(78)**

ئەوەتا جارێکی دی گەڕایتەوە تا بتبینم...
تا یادگاری منداڵی و لاوییەتی
بۆ هەزاران جار بمگۆشێتەوە
بەڵێ گوندە بێکەسەکەم
لەوەتەی هەی دەبەخشی و وەرناگری
تەنها دەبەخشی و هیچی تر
حکومەتێک هات و یەکێکی دی ڕۆیشت

تۆش دەبێ تەنها ببەخشی
دوێنێ پایتەختی ئازادی بووی
خەمەکانت وەکو ڕێگەیەک ڕادەخست
کەژاوەی شادی بەسەردا بڕوا..
ڕەوی باڵندان لە ئاسمانی ئازادی تۆ بەیەکدا دەهاتن
بەڵام بە داخەوە
هەموو بە بەشی خۆیان هاوبەشی لەوەدا کرد



بە تەنیا جێت بهێڵن..
وەک پیرەمێردێکی لە خۆگەڕاوەی بەویقار
کە ترس و تۆقاندن هاوڕێیەتی دەکاو
لە بیرکردن هەڤاڵێنی..
بۆچی ئازیزەکەم!
تۆ چیت کردبوو تا بە تەنیایی
لە بەرامبەر حەقیقەتە تاڵەکاندا جێت بهێڵن

بۆ دەبێ تاهەی هەر ببەخشی
بۆ دەبێ تاهەی ئەی (گەلاڵە)
ئەی ئەو گوندەی تەنها ئەوانە تێت دەگەن کە بە ڕاستی
لە سپێدە بنەوشەییەکانت و
شەوگارە هەڵایساوەکانتدا ژیاون..
هیچ مەڵێ لە زەمانێکدا کە شتەکان تێکەڵ بە یەک
دەبن
بێدەنگی لە هەموو شتەکان ڕاستگۆترە...
تەنانەت لە قیژە و هاواریش.
ئەوەندەش بەسە!

**2005/6/28**



## (79)

چارەنووسمان ڕووەو گوڵە زونبوقەکانە
کە بە ئاسۆی سپێدەدەمان خۆیان دەشۆن
شیعرەکانمان ئارەزوو دەکەن تیپ و وشەکانیان جێبهێڵن
تیشکی ڕاوەدوونراو
تاریکاییەکیش خۆی بەسەر سەرینی حەسانەوەدا داداوە.
چەندی چیرۆک و هەقایەتان دەپشکنم
حیکمەتێک نابینم

یارمەتیم بدات دەستم بە بازنەی ترس ڕابگا..
ڕووت لە منە
ڕووبارێکی شێت
ڕێژنەگەلێک لە سۆز تێری دەکەن
مەملکەتیش
گوێ لە خششەی گەڵاو
ناڵەی ڕێگاو
ئاخ و ئۆفی ڕووبارو دۆڵان ناگرێ..



گۆشەکانی وەجد شووره دەورەی داون.
ماچی ساختە لەسەر شۆستەو شەقامەکاندا
بێ تام و بۆ..
ئا ئەوەیە بەشێک لە دەنگوباسی
ڕۆژگاری سپڵەو
سەردەمی شادیی مردوو و
ئازادی ڕازاوەو
نیشتیمانی خەمبارو
داماو لە نێوان ئاوو کارەبادا..

**2005/7/5**

(80)

داوای پەنابەریم
لە مەملەکەتی مەمکەکانت کرد
منی کە نە ماڵ و نە نیشتیمانم هەیە..
نیشتمانی من جەستەی تۆیە..
ڕەوە گورگیان تێدا نیشتەجێیە..
ئەی ئافرەتە شینە... حەرباکە...



بڕیارم دابوو چیتر مێرگی نیگاکانت جێنەهێڵم
کە تژی شتی نائاساییێن..
چرپەکان.. لۆچی ڕۆژگاری سپڵە دەرمان دەکەن
ڕۆژگاری گومڕایی وشەو
پۆشینی ژاکان
ڕۆژگـــارێک، هەر ڕۆژێ بەشـــێک لە بێ گـــوناهیت
دەکرۆژێ..

وشەکان ون بوون
مەملەکەتی جەستەیشت
ئەوەندەی گازی لێ بدرێت شێوێندراوە
وەکو جاران نەماوە سێوێکی تەڕ..
بەم جۆرە و لە کۆتاییدا بڕیارم دا.
بە لاتی بژیم
داواکەم لە مەملەکەتی مەمکەکانت بکێشمەوە





که ڕەوە گورگی دڕندە تێی بەربوون...
نۆشت بێ ..!
کازیوەو
نیوەڕۆی درۆزن و
شەوە ئەموستەچاوەکان
لە نێو باوەشی هەوەسبازاندا..
نۆشت بێ ئەی ئافرەتی حەربا
ئافرەتە دەست بازەکە!

2005/7/12



**(81)**

سێوێک لە برژانگەکانیدا کەوت
ڕەنگە پرسیارێکی بێهودە بێ
بەڵام ئەمەیە واقیع..
بە چێژێکی بێسنوور دەیکرۆژین
جاریش هەیە فڕێی دەدەین
بەتەنیا باران دەبینم
سپێدەکانم ڕووناک کاتەوە

پەپوولە دەفڕن
وەکو ئەوەی نەخشەی زەمەنێکی تازە بکێشن
چاوم نوقاند
تا ئەو سێوەی لە برژانگیەوە کەوتبوو هەڵگرمەوە
بێ هوودە بوو..
تابلۆی لە تاریکیدا هەڵواسراو شێتم دەکا..
لە پڕێکدا باڕێزە
بە دەم و چاوما دەکێشێ



چاو دەکەمەوە تەنها سەراب دەبینم
بێ هوودەیی دوای بێ هوودەیی
بە نێو جادەو شۆستەکاندا دەخولێتەوە..
بەدوای بۆنی خۆشەویستیدا دەگەڕێت
بەڵام کوانێ خۆشەویستی؟
لە کەش و هەوایەک بە ساختەیی داپۆشراوە..
بە بۆرەعاشقان تەنراوە..
منیش تەنیا ئەوەم لە دەست دێ
بگەڕێمەوەو
جارێکی دی چاو بنوقێنم و
تابلۆی لە تاریکیدا هەڵواسراو لە ئامێز بگرم.

**2005/7/26**

**(82)**

گوێ پێ نەدان لە ناومانی برد..
خەمساردی کوشتمانی..
خەمساردی پەراوێزی کردین..
وەک دەبینی سەردەم سەردەمی خەمساردییە
کە هەناومان دەخواو
یاریی بە خەونە دواخراوەکانمان دەکات
چەند ئاماژەیەک هێشتا لە ئاسۆ ڕا دیارە
مانگ ڕەنگ زەرد..



سەدای بەندەرانیش
بە ناو دڕک و ئەستری خەمساردیدا تێدەپەڕێ
مندالّیی شتان، شەوقێک لە چەقی ڕێگادا
تیرۆرکراوە..
ئالآی داگیراو
بێهوودە دەشەکێتەوە
چەند هەنگاوێک جێوبالنگانی لەوسەر جووت بوون و
پێخەفی وا بۆنی لێ دێ
پەنجەرەکان داخراون

نوور هێشتا لەبێشکەدایە..
ژیانیش بێ ڕوانگە..
گەلەدەنگێک لە لوتکەوە خلۆر دەبنەوە..
هی تریش لەگەڵ هەوراندا لێ دەچنەوە..
گیژەنێکیش خۆی بە تەلانان هەڵپەساردووە
ڕەنگ هێمای خۆی هەیە..
خەمساردی و گوێ پێنەدانیش
چەندین هێما..
با ئەم ڕووبارە جێ بێڵێن و
جوانی ئەبەدی بدۆزینەوەو
شکست بە خەمساردی بێنین
لە هەموو حاڵەتێکیدا خۆرێک هەر هەیە
ڕۆژانە هەڵدێت..

**2005/8/2**



**(83)**

هەقایەتەکان لەگەڵ ئەو نەخشانەدا درێژ دەبنەوە
بۆ پیاسەیەک دابەشمان کردن..
سۆزێکی ڕووت.. هەستی پێ دەکەم
بەو شیعرانە دەگەن
کە بروسکەی عەشقێکی گەرم ڕفاندبوونی
شەپۆلگەلێک لە سپێدەو ئێوارەمان لە بۆسەدان..
گوڵەگەنمەکان لە ژمارنایەن..





گوڵەکان لە ژمار نایەن..
پەپوولەکان لە ژمار نایەن..
بێگومان خۆشەویستیش نایەتە ژماردن..
پۆشاکێک لە ڕەنگی پیرییەتی
«خانەی بکوژ» تێم ناگا
من کە سرووتی پیرۆز بە خوێندنەوە دەخوێنمەوە..
نیشتمانێک لە نێوان هەنگوین و ژاڵەدا
نیشتیمانێک لە نێوان بێدەنگی و هاواردا
لە نێوانی درۆ و ڕاستیدا

بەرەو کوێ دەچین؟
دادپەروەری بووە بە کەمالیات
ئارەزووبازی لە خۆشەویستی بەهێزترە.
ساتێکی شەرمنە
خەونەکانمان بەپێی پەتی لە شەقامەکاندا ڕادەکەن..
ساتێکی شەرمنە..
کە هاوین ئەو مەمکانە دەشارێتەوە
بۆنی یاسەمینیان لێ دێ..
لەم ڕۆژگارەدا
پیشەسازییەکی چەند قورسە،
پیشەسازی خۆشەویستی..

**2005/8/9**



## (84)

سپێدە باڵەکانی بە ڕوومەتی گەشی تۆ دەکردەوە
تیشکیش هەورازو نشێوەکانی داپۆشیبوو
دەسبازیی لەگەڵ ژێیە لە چۆلایی فڕێدراوەکاندا دەکرد
ئەمە نرخی سەرهەڵگرتنە
بە بێدەنگی و بە چرپە دەیدەین
چارەنووسمان تارمایی پەرییان ڕادەکێشێ،

ئەوانەی بەبێ خواحافیزی ڕۆیشتن..
باڵندەی ئازاد لە ئاسمانێکی نادیار
بە دڵی ماندووەوە..
لە کونج و ڕێگاکانی هەواداریی هەڵگرتووە.
لێشاو لە قرچەی هاویندا
لە بەردەم کاروانی پێخواساندا
هەناوگەلێک تەنها بەتاڵی تێدا دەبینی
سەرەتاکان وەک کۆتایی دەردەکەون
ئا ئەمەیە دنیابینی پەنجەرە تەنیاکە
کە بە تەنیا هەر ئەوەندە دەزانێ
لە بەردەم چاوە خەواڵووەکان
مۆسیقا لێ بدا..

**2005/8/23**



## (85)

هێشتا خەون
گەمە لەگەڵ ئاوێنە هەڵخەڵەتێنەرەکاندا دەکا
کە ئاسۆی وا عەکس دەکاتەوە
شایانی ڕوانینە شینەکانی تۆیە
ڕۆژگار بە هەناسەبڕکێیەوە
وەکو فرمسێکی ئەو ئەشکەوتانەی بەکەزیەکانت
شەختەبەستوو، شۆڕبوونەتەوە..
جەستەیەک کەڵبەی وا کێڵاویانە

شتێک لە زانستی ساو و لێکەوتن نازانن
هەندێک جار گوێ نادەمێ
لە برینە خوێن لێ چۆڕاوەکانم دەخۆمەوە و
زەنگت بۆ لێ دەدەم
کەچی لە بێدەنگی زیاتر نابیسمەوە..
بۆ هەرکوێیەک دەچم تەنیایی هاوڕێمە
شەو ساردە.. سارد
منیش پڕم لە نائاساییەتی
نەمدەویست سێبەری مەمکەکانت جێ بێڵم
بەڵام تۆ هاتی ناخی ناخمت هەڵکۆڵی



هەموو مۆمەکانت کوژاندەوە
ناچارت کردم شانۆگەریەکە کۆتایی پێ بهێنم و
پەردە دادەمەوە..
بێ دەستخۆشی.. بێ ئافەرین
لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا
لە ئاسۆدا هەمیشە خۆرێک هەیە
ئێوارەکانم ڕۆشن دەکاتەوەو
بە کەزیە زێڕینەکانی دادەپۆشێ..

**2005/8/30**

**(86)**

هەندێ جار لە بێ ئاگایی بێدەنگیدا
دەنگت بەسەرم دادەدا
دەمبینی پاڵی پێوە دەدەم
هەورێکی دووگیان
ئازارەکانم دەگوشم کە بۆ هەر کوێ دەچم لەگەڵم دان
ئومێدیش لە ڕێگەدایە..





خۆزگە نەتمبینیبایە
تاکاتێ رقم لێت دەبێتەوە
بە هێوری ڕقم لێت بێتەوە..
بە پێچەوانەی ئەو ڕۆژانەی
بەوپەڕی هێزەوە خۆشم دەویستی..
کاتێک خۆشم ویستی بە توندیەوە خۆشم ویستی
خەیاڵێک لە بۆنی گوڵانەوەم بۆ دێ
کە لە یەکەم پێک گەیشتن مابووەوە



وێنەکەت ئەوەتا لە تەمومژەوە دەردەکەوێ
ڕووەو برینەکان دێ
هەوڵ دەدەین زەمان بگەڕێنینەوە دواوە
غەریبین و لە تاریکیدا ڕادەکشێین
نمەی باران تەڕمان دەکات
لە تەنیاییەکی بێ سنووردا سەوڵ لێ دەدەین..
جێوبالنگانمان کە بەجێ خەوی فریشتان دەچێ...
سەوڵ لێ دەدەین..

منیش بە گوێتدا دەچرپێنم .. خۆشم دەوێی
دەنگ دێتەوە.. خۆشم دەوێی
ئای خۆشەویستەکەم!
بە وەهم دەستمان پێکرد
بە وەهمیش وەهمەکانمان بەردەوام بوون
بە وەهمیش خواحافیزیمان لەیەک کرد
تەنها لەو کاتەدا زانیم
کە ڕەنگە ڕق هێرش بەرێتە سەر
هەموو بازاڕ و کوچەو کۆڵانان..
ژیانیش بەبێ ڕوانگە خۆی دەنوێنێ..

**2005/9/6**



**(87)**

ئەم ئافرەتە،
هەر چەندە ماندووە
بەڵام وەکو گەردەلوولە
بە دوای سەرابدا ڕادەکا...
ئەم ئافرەتە،
وا پێدەچێت واز لە هەوای خۆی ناهێنێ
هەمیشە تێیدا دەگەشێتەوە..

هەندێ جار هەستەکانی دەیترسێنێ
جاریش هەیە سەر ئێشەی پاڵ کەوتن
شەرمەزاری دەکات..
لە شەڕێکی گەرمدا
وەک بلّێی بەرەو ڕووی شکست بووبێتەوە..



ئەم ئافرەتە،
کە وەک گەردەلوول بە دوای سەرابدا ڕادەکات
لە پێخەفێکەوە بۆ ئەوی دی دەچێ
سەر لە دارستانی تاریکی دەدات
لە شتێک دەگەڕێت
باناوی بنێن سەرمەستیەکی کاتیی
وەک کەسێ جگەرەیەک دادەگیرسێنێ
یا لە هەندێ شتی سەیر وورد بێتەوە

کاتێ لە بانێژەکەوە
زەمانی هەوەسبازی
بۆمبا چێندراوەکان و
ئۆتۆمبێلە مینرێژەکراوەکان..
بەم جۆرە.. ئەو ئافرەتە تەنیایە
لە دەرەوەی پۆلدا دەخوێنێ..
لە باراندا خۆی دەشوا
وەکو گەردەلوولیش بە دوای سەرابدا ڕادەکا.....

**2005/9/14**



**(88)**

گوێ ڕادەدێرم
لە دەنگتەوە
کە ڕۆژێ لە ڕۆژان گرفتاری کردم
ڕوخسارت لە پێشمدا بەرجەستە دەبێت.
بەڵام بە داخەوە سەرەدەرێکی درەنگ بوو
ئەو کاتە هات کە بانێژەم جێ هێشت بوو





به داخەوە!
هیچ لە تۆدا نەگۆڕاوە
تۆ تا ئێستا
لە نێو هەموو کەزیە خاوبووەکانت
کەزیەک لە «وەجد»شک نابەی
هێشتا هەر بە سەرابەوە سەرسامی
وا پێ دەچێت من وشەکانم بە فیڕۆ بدەم
کینەو ڕقت تێدا
وەکو خوێن لە دەماراندا دەگەڕێ

سرووتگەلێک هەرگیز لە ماناو جوگرافیایان ناگەی
یاری چاوشارکێ و خۆحەشاردان
لە پشتەوەی گوتاری والآدا..
ئای خۆشەویستەکەم..
ژیان کە بەو چەشنە نییە
بۆچی ناهێڵێ نووربێتە ژووری هەمیشە تاریکت
بۆچی نوور بە خۆشیەکی کاتی دەگۆڕیەوە؟
بۆچی درۆکردن هەموو کات شوێنی دانپێدانان دەگرێتەوە
تاکەی بەرهەمهێنانی وەهم
من بەڕاستیەکی بێزار خۆشم دەوێی
کە هەر ئەمەشە تاقە گوناهم..

**2005/9/20**



## (89)

داوام لێ دەکەی لەمڕۆوە بە دوا نەنووسم
ئینجا کەست بینیوە داوات لێ بکات هەناسە نەدەی؟
من ئاوەهام.. لە نێو پەنجەکانتدا خۆم دەشارمەوە
کە بتەوێ و نەتەوێ، بوونەتە قەدەرم
خۆشەویستی سنووری نییە..
خۆشەویستی دیواری نییە..

ئاسۆیەکی بینراویشی نییە..
چەند هێشوویەک لە بازنەی تیشک دا
گەوهەری شتەکان دەشارێتەوە
لەگەڵ ڕۆژگاردا
مۆمێکە بە تێڕامانی کوژاوەمان گڕ دەدرێ..
ئای خۆشەویستەکەم!



چەند ئازارت پێویستە
تا ساتێ سۆزم پێ ببەخشی؟
چەندت لە شەو دەوێ
تا ساتێک لە تیشکی چاوتم پێ بدەی
داوام لێ مەکە واز لە نووسین بێنم
ئاخر نووسینیش
وەک نیگای تۆ بووەتە قەدەرم
ئەی ئەو باهۆزەی ڕووەو من هەڵی کرد و
ئارام نەبووەوە..

**2005/9/28**

## (90)

هێشتا هەر بە دوای کلیلەکەدا دەگەڕێم
زەینڕوونیمان بەرەو
ناوچەی نوێ ڕاماندەکێشێ
بەرەو کەوتنی دەمامکەکان و
پێوەدانی با
بەسەر ئەسپێکی قەرەجانەوەت دەبینم



ڕەنگی دروەشاوە بەدوای خۆتدا جێ دێڵی
دڵنیانیم لەوەی زڵکاو چاوەڕوانت نەبێ
من گومانم لە ئێش هەیە
نەیەتە ڕێگات
هەست بەوە دەکەم
لەوانەیە شنەیەک بەسەرماندا بدات
لەو کاتەی باوەشمان بە یەکدا کردووە
لە بێ ئاگابوونێکی وەهمدا
تێکەڵ کەلاوەکان دەبین و

تەوقە لەگەڵ ئاسمانی گێرەشێوێنەوە دەکەین
لەو کاتەدا بێ مانایی
وێنەی ڕەشەبایەکی سەرشێت.. لە دایک دەبێ
ئەوسا پێکەوە
بە دوای فرمێسکێک بۆ چاوەکانمان دەگەڕێین
بۆ ڕووبارێک بەسەر جەستەی شەکەتمانەوە دەڕوا
وەک تریفەی مانگ.. وێنەی ئاوازێکی بێ کۆتایی
بەسەر جەسەتدا تێدەپەڕێت..

**2005/10/4**



## (91)

تاریکایی بێنەوە بەرچاوان
وەک کەسێ.
جووت لە کێڵگەی هەناسەکانیدا بکا..
خەیاڵی سیماکانی خۆت بکە لەبەر ئاوێنەدا
سیمایەک لۆچی دڵڕەقی تێدا دەرکەوتووە
سیمای دیکە پروشەی باران دەیشواتەوە
ڕکابەری بەردەوامە..

ژیانیش بێگومان بەردەوام دەبێ...
ڕۆژێکیش دێ
ویژدانە نووستوەکان بێدار دەبنەوەو
خۆیان بە بەردی چارەنووسدا دەدەن
کە جێی بەزەیی پێدا هاتنەوەیە..
دیارە هەموو شتێک بۆی هەیە مینرپێژ بکرێ





له ئۆتۆمۆبێلەوە تا مرۆڤ
تەنها خۆشەویستی نەبێت کە ناکرێ مینرێژ بکرێ
خۆشەویستی ئەگەر هەبێ
لەوانەیە گوڵێک یا فرمێسکێک بیکاتە ئامانجی خۆی
یاخود خەندەیەک..
بەڵام قەت ناشێ
ببێتە نیشانەی گوللە
یا درۆکاری بیخنکێنێ.

**2005/10/11**



**(92)**

دواجار
پاش هەموو دەردەسەریەکان و
هەڵشاخان لەگەڵ خودو
دڵی نەفرەت لێکراودا
گەیشتمە ئەوەی
هەموو دۆسیەکان دابخەم

که پەیوەستن بە هێرشی سەر ئیرادە
غەزای ڕق لێ بوونەوە..
بۆنی زڵکاو
کە وا پێ دەچوو
دەتگوت فرمێسکە بە قووڵایی
لۆچەکانی دەم و چاوتا دێتە خوارێ..
کە لە گۆڕاندا بەردەوامە..
لە کۆتاییدا دەرکەوت
هیچ چەکێکت پێ نەماوە



چەکی لە ناوبەروو، چەکی ئاسایی
تا بەبێ ئەوەی بە خۆت بزانی
یا ڕەهەندەکانی لێک بدەیەوە
دوا وشەت ڕاستگۆیانە
بۆ یەکەمین جارِ لە دەم دەرچوو!
کەواتە باوابێ
ئیتر گوێم لێ ناگری..
بەم شێوەیەش بێ، بێ ئەوەی بزانی
لە دەستی ئاگری خامۆش بووت.. ئازادت کردم..
بەڵام دەبێ ئەمەت لە بیر نەچێت
کە لە هەموو حاڵەتێکدا خۆرێکی هەمیشەیی هەیە
بۆ هەموو ئەوانەی ڕووناکاییان خۆش دەوێ.

**2005/10/18**

**(93)**

من باڵندەم و لە ئاسمانی چاوتدا دەفڕم
چرپەیەکی سۆزڕێژکراو
نەورەسی نیگاکانت لە باوەش دەگرم
کە لە نێوان گومان و دڵنیاییدا سەریان سوڕماوە..
چیتە دەڵێی لە ئیرادە داماڵڕاوی
بە داخەوە تاریکی مەمکەکانتی داپۆشیوەو
لۆچیی هێرشی بۆ هێناوە
کە ڕۆژێ لە ڕۆژان دوا پەناگەم بوو.



لەو کاتانەی تۆ لە دووڕیانێکی نادیارا بووی
من باڵندەم
دەفڕم بەبێ ئەوەی هیچ لە زانستی فڕین و
کەشی بەرزەفڕی و
جوگرافیای جەستەی ڕاکشاوی
ژێر ڕێژنەی بارانی خۆڵەمێشی بزانم
بۆچی خۆشەویستەکەم؟
چیت لە ڕاکردن بە دوای سەرابەوە چنگ کەوت.؟
چیت لە ژێر باڵی شێوێندراوەوە دۆزیەوە؟

که هاتبوو خامۆشت کاتەوە
که تۆ وانیشان دەدەی
بە سروەی خۆشەویستیەکی ئەبەدیەوە
هەڵبووبی..
بە داخەوە خۆشەویستەکەم..
برین قووڵە..
شووشە شکاوە
ئیتر کۆناکرێتەوەو پێکەوە نانووسێتەوە....

**2005/10/25**



## (94)

لە ژێر باڵی وادا خۆم حەشاردا
سۆزی زەوی لە فڕینی خستوون
خەواڵوو بووم، باوشێک بۆ خۆی ڕاکێشام
ڕاکشاو .. تا ئەو پەڕی گینگلم دەدا
ئەمن خووم بەو گرتبوو
ئەویش بەناز و فرت و فێڵەکانی دەمارەکانمی دەکوتا
من لە چەقی خۆشەویستیدا تەنیا بووم

نەمدەزانی ئاوڕ بەلای ڕاست و چەپدا بدەمەوە
ئەویش لە نێو ئاپۆرەی هیچوپووچان ڕێی گرتبوو
ئەوانەی بە دەست بەسەر داگرتن،
دەستیان بەسەر ڕۆژگاردا گرتبوو
بە قاوەیەک نایخۆینەوە
بەڵام ئەو، ئەو ئەوەتا ڕێی گرتووە
لە هەوەسی کاتی بەدەر..
لە پیاسەیەک، کە بە ئاوازی خۆشەویستی دەزانێ
لە وەنەوزێکی کاتی زیاتر نییە



لە ژێر باڵی تاریکیدا هیچیتر نازانێ..
من لەودا پاشماوەم ماوە
لە چرکەو دەقیقە و سەعات و ڕۆژ و هەفتە و مانگ و
ساڵ
لەسەدای هەناسەبڕکێ
لەودا من پاشماوەم هەیە
چراوگی بەفرمێسک هەڵبوو
با قەت لەو خەیاڵەدا نەبێ
خەم کۆتایی نایێ
ئیتر ئەوکەسەم دۆزیەوە کە ببێتە ئاودەنگ و هاوخەمم
سندان لە ڕۆژگاری چەپەڵ..

**2005/11/8**



## (95)

ئەو کۆتەڵانەم هێنانە گۆ
کە مافیاکانی قاچاخچیەتی لە مەزرایێ فڕێیان دابوو
چەندین جار بێهوودە دەرگای پاسەوانەکانمان کوتا
ئا ئەمەیە ڕۆژگاری نەخشێنراو بە درۆو ڕیاو دووڕوویی
ڕۆژگاری ئەو پاشایانەی بەسەر گۆچاندا کەوتوون
کەنارگەلێک تەنانەت گەمیە بچووکەکانیش

لەنگەوی تێدا ناگرن
ئەم گەڕەلاوژانە توندوتیژن
کە لە ئاودا ڕەوانی و
لە زەنگەکان زرنگانەوەو
لە سیمای غەریبانیشدا گەشایەتی وەردەگرن.
سپێدە لە کازیوەوە
ڕێگاکانیش لەسەرەتاوە دەڕوخێنن..
ئەوانە داگیرکەری تازەن
خراپەکاری لە زەمیندا بڵاو دەکەنەوە



بێ ئەوەی بزانین بۆچی و بۆ کێ؟
ئیتر با سنوورێک بۆ ئەو دڵڕەقیە دابنێین
کە پەنجەرەکانمان لەبەر چاو دەشارنەوە
پەناگەیەک بوون بۆ ڕامان لە هەور... لە باران
با ئاوازی دێرینمان لێبدەینەوە..
ئاوازی خۆشەویستی و دەرکەوتن و درەوشانەوە..
**2005/11/15**

## (96)

ئەوە ساچمەی شادیەکی لە ناکاوە
لە پەنجەرەڕا، تاکە ڕێی ڕوناهی.. دێتە ژوورەکەمەوە..
گۆی مەمک لە خۆشەویستیدا سەما دەکەن
سەرمەستیەکی سەیر کە نەمدیوە
وێنەی تەم دەخزێتە پێخەفم
کەشوهەوا موژدەی بەهارێکی دیکەی پێیە
منیش هاشەی ڕەشەبایەکی سەرشێت دەمترسێنێ



چاوەکانم بەشی ڕوانینم ناکەن
گەر بمەوێ ئێشی شادی کۆکەمەوە..
باوەشم لەوە تەنگترە
ئەو بەژن زراڤە بە خۆیەوە بگرێ.
سنگیشم لەتوانایدانیە لەگەڵ ئەو هەموو ساچمانەدا بێتەوە
هێرش لە پەنجەڕایە
تاکە ڕێی ڕوناهی
من چی بکەم؟

لەو بەریش
مێگەلێک هەوەسباز
بە هەناسەبڕکێ و
هێدمەی نائاساییانەوە
لە بەرامبەر پەنجەرە ئاساییەکەمدان..
کە یەک بە دوای یەک
ساچمەی پێدا دێنە ژوور..

**2005/11/22**



## (97)

هەندێک جار بێداری دەمترسێنێ
بە وەنەوزەوە ڕاهاتووم
ڕەنگە بۆ تۆزێکیش بێت
لە دلڕەقیی هەڵوێستە هەرزانەکان دوورم دەخاتەوە
کە گێژەنی ڕۆژگارە دەمامکدارەکان فڕێی دەدا
بۆرە پیاوانی
لەگەڵ سۆزو باراندا هەڵگیرساندووە
پەپوولەش
باڵیان کردووە بە قوربانی بایە سەرشێتەکان






له ترسی ئەوەی نەبادا
بیانخاتە نێو بازنەی تیشکە بکوژەکان..
تاریکی دەست لە ناو دەست
لەگەڵ سیمای لۆچاوی مانگی خەمبار تێکەڵ کردووە..
چرپەیەک، نازانم لە کوێوە دێ
پێکەنین و خەندەم بریندار دەکاو
هەنگاوەکانم تێکدەئاڵێنێ
دەنگێکی کز بانگم دەکا
ئاوڕ لە ڕاست و چەپی خۆم دەدەمەوە

کەس نابینم
وشەکانم باڵ دەگرن و دەفڕن و
لە تەنیاییدا
لەگەڵ پۆلی سەدادا جێم دەهێڵن
ڕێژنەیەک لە ئاوازی ساردو سڕ
هەنگاوەکانم .. تێکدەئاڵێنێ..
پاشان..!

**2005/11/29**



## (98)

خۆشەویستی وانییە
لە بێبەشی و وەسڵ تێرم بکەی
ئەمە دڵڕەقییەکە، دڵڕەقی وەکو خۆی نییە
کەزیەکانت
بۆ ڕەوی قەلەڕەشان ڕادەخەی
کە تێدەپەڕن
تۆش لە زەویدا ڕاکشاوی

بێی ئەوەی بەزەییت پێدابێتەوە
باڵت نییە..
بچن لە نێو پەلکی درەختێکی هەمیشە سەوزدا
جێگیر بن
ئێش و ئازاری ڕۆژگاریش لە دڵمدا کەڵەکە دەبن
سیما ڕۆچووەکانمان لە نێو ماناو بێ ماناییدا
ماندوومان دەکەن



ئێمەش لە ژێر قیبلەنومای خۆڕازاندنەوە
شەڕ لەگەڵ «با»دا دەکەین
ڕێورەســـــــمی ڕق لێ بوونەوەش لـە بەردەم ئاوێنـەکی
هەڵواسراودا
دەستی پێکردووە..
شێواندن لە ئێمەیە یا لە ئاوێنە؟
چاوی ڕاستەت هەڵدەگلۆفی
لێ لە ئاوێنە وا دەردەکەوی وەکو ئەوەی

چاوی چەپت هەڵبگلۆفی
لێدانێکی لە هیکەوە
وەک هەمیشە لە پشتەوە..
ئای خۆشەویستەکەم..
ڕۆژگار ڕۆیی و ئێمە نەکەوتینە باوەشێک
یا گوڵەگەنمێک
خوێن و دەمامک تەمەنی کورت کردینەوە
ڕامانەکانیشمان لە دوو تۆێی پەنجەرەیەکی پشتگوێخراو
ئەوەی بە تەنیا
دوای ئەو هەموو بوومەلەرزانە
ماوەتەوە..

**2005/12/4**



## (99)

ئاوڕ لە دواوە مەدەوە
ئێمە نزیکین لە هەڵایسانی مێژوو جوگرافیا
دەبا بەشێک لە ڕوونایەتی فرمێسک و
بۆنی گوڵە کیویلەکان وەربگرین
کە بۆ چارەنووسی خۆیان بە جێهێشتراون
بێ بەهایە..
بێ بەهایە ئەو گێژەنەی لە وشکاییەوە هاتووەو
بە نێو لۆچاییەکانی چەهرەماندا دەڕواو

پەنچەرە دەرکێشراوەکانمان دەکوتێ
ئاوڕ مەدەرەوە..
منم لەبەر خۆمەوە گۆرانی دەڵێم و
دڵنەوایی دوا سەرەتاکان دەدەمەوە
شەپۆلی لمیش سەراب تووڕی هەڵدەدات
بە ئیجازەی خۆت!



دەکرێ خۆشەویستیمان. هەڵنێینەوە؟
کە بە بومەلەرزەی درۆیان دارماوە؟
داوای لێبوردنت لێ دەکەم.. دیارە کە ناکرێ..
وشەو تیپەکانم هەمووی لێ ون بوون
هیچم بە دەستەوە نەماوە
ئەوە نەبێ لە بەر خۆمەوە گۆرانی بڵێم
ڕەنگە گۆرانی  بە خۆداگوتن لە ڕۆژگاری کەڕاندا
زۆر چاتربێ
لە زۆر بڵێیی و درێژدادڕی..

**2005/12/20**






**(100)**

که به دەست لێکوتان دەمدیتی
پەپوولەکانی غوربەت
لەسەر داری کەنارەکاندا کۆدەبوونەوە
که به هەناسەی باهۆزو تەموتومان سەمایان دەکرد
ئافرەتێکی ماندووش وەستاوە لێیان وورد دەبێتەوەو
فرمێسکان هەڵدەبارێنێ..

بۆ سەنگەری شادی، خاڵی لە هەموو شتێک
لە شوێنی پێی نەبێ..
کە وەهم جێ دێڵێ و دەڕوا
ئێش و ئازاری زەمانە دوایی نایێ
لەگەڵ ئەوەشدا ژیان هەمیشە جوانە.. هەمیشە پڕە.
ئەمە ئاوازی بوونە
لە گوێماندا دەزرینگێتەوەو
بە جەستەی شەکەتمانەوە دەنووسێ..
منیش بە دەست لێکوتان دەتبینم..

**2005/12/27**



## (101)

کەمەندێک لە نادیارییەوە شۆڕ دەبێتەوە
چارەنووسم وایە
لە تەلانی وێکنەچوونەکانەوە پێی بگەم
چاوەکانم هەڵگلۆفم
لە کاتێکدا خەریکم جگەرە بە جگەرە دادەگیرسێنم
لەو لاش، لەو دیوەوە
دڵێک لێدەدا .. دەڵێی کاتژمێرە..

له قوولایی ڕووبار لێ دەدا
ئەمە ئەو بێدارییەیە
بۆ خۆیمان ڕادەکێشێ
که هەندێک کات بە خۆشەویستی ناوی دەبەین
هەندێ جاریش هەواداری
که پڕمەی گریانێکمان له ناودا دەچێنێ
چەند شتێکیش لە ژیان و مردن..
بێ دەستی خۆمان پێ ڕاهاتووین



لەوانەیە بتە مرۆڤ بن
یان سێبەری جەستەی شاراوە
که لە  ژێر باری دڕندایەتیدا بناڵێنێ..
ئەو تەنانەت خۆشی
لە بەردا نییەو
جار هەیە ناوی دەبەین
هەندێک جاریش بەبێ ناو جێی دێڵین
ئەمە بێداربوونەوەیە
یا ڕەنگە وەنەوزبێت، جیاوازی نییە
بێ ویستی خۆمان ڕاماندەکێشێ.

**2006/1/3**

**(102)**

مانگ لە ڕێزی ئەستێرە خەواڵووەکاندا
باهۆزی دڵەڕاوکێ خلۆری دەکاتەوە
لێ داخ
مانگ بە ورشەی
لە زۆنگاوەکەدا هەڵبەزو دابەزیەتی
من هەڵنایێم
دەرگاو پەنجەرەکانیشم داناخەم..



شەڕەکان بوون شادیان تیرۆرکرد
تا خۆڵەمێش دەربخەن.. دان و ڕەگ بە رووتی
بەسەر پاڵتۆی کۆن بوومدا تێدەپەڕن
هەندێک جار پاساو بە پێچانەوەی خەمەکانم دێنمەوەو
ڕێگا بە پێچ و گەوەکان دەگرمەبەر
هەندێ جاریش
سەر بە گاشە بەردێکدا دەکێشم
تا ئەو شتانەی تێیدایە بزرنگێنەوە
کە بە ناشوێن و ناکات دەچن

هەندێ جار دەبریسکێمەوە
ئاخرمنیش
زۆنگاو بۆ خۆیم ڕادەکێشێ
کە مانگ بە تریفەی هەڵبەزو دابەزیەتی تێیدا
ژنێک، ئەویش ڕەنگە بچێتە ناو زۆنگاوەوە
لەوانەیە بۆ ماوەیەک
بە قەد ماوەی داگیرساندنی جگەرەیەک و کوژاندنەوەی
هەڵدێر ڕامان دەکێشێ
ئێمەش بەداخەوە سەرمان سوڕماوە
هەستایەتیمان جێ ناهێڵێن



تاریکستانیش بەرەو نادیارمان دەبات
داخۆ دەبێ چیتر
پاش هەڵوەرینی دەمامکەکان...؟!
داخۆ بۆمان هەیە
بڵێین «ئێمە بە هیوا حوکم دراوین؟»..

**2006/1/24**




## (103)

ئەی هەوری دوور و نزیک
لێمان گەڕێ بەتەنێ بین
با بە تەنیا شوورەو سنوورەکان تێک بشکێنین و
بەسەر دڵماندا بدەین
پەناگەیەک نەما داڵدەمان بدا
خاکێکی سەیرە
ڕێگەی وێڵی لەسەر کێشراوە
ڕۆح تێکشکاوە

له یادیشدا پاشماوەی وەهم
ناومان ناوە خۆشەویستی
کە لە ڕاستیدا لە جانتای پیاسە زیاترنین
هەموو ئەو شتانەی تێدا دەشارینەوە
پەیوەندیان بەو وەهمەوە هەیە
سۆزم ئافرەتێکی شینی تژی درۆکاری ونی کرد
وێنەی سەرابێک بە دوویدا ڕادەکەین
نە بۆ ئەوەی بیگەینێ



بەڵکو بۆ ئەوەی بیخۆینەوە
ئەی هەورەکە! گوێ ڕادێرە..
بڕوانە کۆنە هەواران
تەماشا چڕنۆکی ڕۆژگاری بێ وەفا
بە زوڵم و تاریکستان تیژ دەبێتەوە
ئای .. خۆشەویستم
ئێمە وەک دەیبینی نزیکین
لەو ملوانکانەی
بە شەوقەوە لە عەشقدا دەبریسکێنەوە

قەسیدەکانیش
لەژێر تینی ڕوناهییدا نووزەیان دێ
چەندین جار لە دارِمانی سەراب دا
لە پێناوی چاوەکانتدا
لە پێناوی چرکە ساتێکدا
کە بەسەرمدا مەستانە دەبارێی
وەک خۆ لە جەستە سوینت
ئا ئەوە ئەو هەورە بوو
نەیهێشت بە تەنێ بێن
شوورەو سنوورەکان تێک بشکێنین.

2006/1/28



## (104)

ئەگەر باران بەم توندوتیژیەوە
لە هیکەوە بۆردومانمان بکا
دەبێ چی لەگەڵ بێهوودەیی حەسوودو
مێگەلی هەوەسباز و
هەستە ڕەشەکانیان بکەین
چی لەگەڵ لۆچی پێکەنینە مردووەکانیاندا بکەین؟

بەڵام.. نا
باران خیانەت لە برادەرانی ناکات.
ئەو تەنها ئەوەیە جاروبار ختوکەمان دەدات
تا هەست بە حەقیقەتی خۆمان بکەین..
ئەوە پیاسەیەکی زستانی
هەژارو نەدارانی نیشتمانەکەم بوو
لە سەردەمی بۆمبی تەوقیت کرا و و
ئۆتۆمبێلی مینرێژ کراودا
سەردەمی مێژووی لە جوگرافیا دوورو



جوگرافیای ژێر باڵی باڵدارە ئەنفلەوەنزا گرتووەکاندا
حەشاردراوە..
ئای ئەی بارانی تووڕە
چەند گیانی بێ تاوان و
کۆنە پاتاڵت دەوێ
لە دۆڵاب و باوڵ و
جلی شڕی پینەکراو..
کە هەر ئەوەندەش لە دارەتی دونیایێ شک دەبەن...
بە چەند نیگای شەکەتی منداڵان
کپ دەبیەوە؟
«تەنانەت تۆیش باران..»

**2006/2/7**

**(105)**

ها نەژاد خەریکی چیت
لەگەڵ هەموو ئەو ئەگەرانەی
جێی بەزەیی پێداهاتنەوەن و بازاڕیان تەنیوە؟
چی لەگەڵ مانگی ساردو سڕدا دەکەی؟
لەو شەوانەی شنەبا هەڵدەکەن
کە لە ئازارەکانی ڕۆژگارەوە هاتوون؟



هەزار بە هەزاری مەمکان..
لە ڕۆژگاری ڕق و کینەدا
لە خڕۆکەی نوور دەچوون..
چی لەگەڵ valentinدا دەکەی
هەژمورونی سوالکەرە پۆستمۆدرێنەکان
کە تێڕوانینە خامۆشەکانیان دەخەنە ڕوو
وێنەی شمشێری دارین
بە دوای لوتکەو بەفرەوەن..






**ها نەژاد!**
**چی لەگەڵ مانگی سارد و سڕو**
**بۆرەپیاوە سەرخۆشەکان دەکەی**
**کە لە هەڵایسانی پێک ناگەن و**
**بەخۆڵەمێشی بۆگەنیان**

خۆشەویستی مینرێژ دەکەن..
چ دەکەی نەژاد ؟
لەگەڵ ڕۆژگاری سپلە
کە بووەتە جێی پووچیی و
زەڵکاوی ئەستێرە خەمبارەکان.
چیان لەگەڵ دەکەی نەژاد.. براله ؟

**2006/2/14**



## (106)

لێمان گەڕێ با تۆزێک باس لەو دارستانە بکەین
کە تەنها
لە ڕۆژانی بڕانەوەی سوتەمەنیدا بە بیرمان دێتەوە
ئەو دارستانەی
تاریکی و نووری پێکەوە لێ دەژین..
لێمان گەڕێ باتۆزێک قسەیان لێ بکەین
ئەو ڕۆژانەی بە زۆر پێیاندا دەڕۆیشتین
هەر بە زۆریش لێیان دەهاتینەدەر
سرپیی ئەو گەرمیەی باسیان دەکرد

نایدۆزیتەوە
تەنها لە سێبەری ئەو درەختە پیرانە نەبێ
دەبا چاوەکانمان هەڵگلۆفین و پێیاندا بڕۆین
وەک ئەسپێکی  سەرشێت
پێخواس.. پاک پێیدا دەڕوا
بۆمان هەیە مەزموری نوێ بنووسینەوە
لەوێ لەو زەوییە دەست لێ نەدراوەدا
کە خێڵی دزوجەردانی نەگەیووەتێ
هەر لەوێشدا بۆم هەیە
خۆم لە ژێر باڵەکانتدا بشارمەوە
ئەی تیشکی گەشاوە؟
تەنیا لەوێدا...

**2006/2/21**



## (107)

سیمات ماندوو
کاتێ لە ژێربارانی چاوەکانمدا خۆت دەشۆی
وەک ئەوەی لە شتێک بگەڕێی
وەهمی دەنگ بەسەرتدا دەدەن
بێ هوودەش لە گوێیەکانت دەزرنگێنەوە
بۆچی عاجباتی دایگرتووی
دوا شکست لە جەنگی جێی خەوە سوورەکان

بنکۆڵ کرا.
هەموو ئەوەی دەیبینی و نایبینی
گێژەنی ژیانە...
درەختی سەرەڕێیان
بەلیتاو دادەپۆشێ و
چەهرەت بە لۆچی و کەندڕان دەسپێرێ
خۆشەویستی لای تۆ پەنجەرەیەکە بە ڕەنگی دیوار
زۆر دوورە لەوەی هیوا بخوازین بیبینین



لای منیش ئاوازێکە بەڕەنگی ئاو
بێ دەنگی و سەدا پاک دەکاتەوە.
جارێکی دی خۆشم دەوێی
لە بێ ئاگایی ڕق و کینەو
چاو لە چاوبڕیندا
کاتێک دەرک بە کات دەکەی
کە لە نێو ئەو ئامێز و ئەوی دیدا ون دەبێ
ئاخ ئەی ئافرەتە شینەکە!
لە سەردەمی بێ پەردەییدا
جورئەت بدە خۆت و چاو بنووقێنە
ئێمە لە جەنگێکداین سوێندم خواردووە
لە دەرەوەی ڕوانینەکانیش بێ
بیگەێنمە سەر.

**2006/4/26**

## (108)

له دواییدا نەژاد
پاش ڕووبەڕووبوونەوەی زەمانێکی دڕندە
کە لەبەر دەمتدا ڕاکشابوو
پاش ئەو هەموو بۆگەنی و ڕق و کینەو
هەلپەرستیە...
کە هەمیشە دەتویست بە خۆشەویستی



چارەسەریان بکەی
ئەو بوونەوەرەی پێدەچێ
لە بەرەکانی جەنگە شاراوەو ترسنۆکەکان بێخەبەر
چووبێ..
ئەوە تۆی نەژاد؟
لە کۆتاییدا گەیشتیە ئەوەی دادگایی بکرێیت
بە تاوانێک ڕووی نەداوە!!
سەدای وێڵ
بە دوایی شتێکدا دەگەڕێ..

له نێو.....
ئەوەتا من لێرەم نەژاد
ئەی کۆپیەکی ماندوو لە خۆم...
بێداریی ئەوەتا بەرەو ئاراستەی
تێکدانی وەهم دەچێ..
کلیلی خۆری هەڵاتوو لە دەستی مندا
هەر دەبێ تاریکی بە دەوری خۆیدا گرمۆڵە بێت
وێنەی باڵۆنە کون بووەکان
ئیتر کۆمپانیای دروست کردنی وەهم
بێ سوودە..
فایلەکانت لە بن هەنگڵ نێ و بڕۆ
بڕۆ نەژاد..
بڕۆ...ڕامەوەستە!

**2006/3/1**



**(109)**

بارگەیان تێکناو نەهاتنەوە..
دەنگی نووساو
لە تامەزرۆیی کۆڵانە ساختەکاندا
وا پێدەچێت ئومێدی چاک بوونەوەی نەبێت
لە گەڕەلاوژەی سەدای زەنگەکاندا
پێناچێت،

لەگەڵ غوربەتدا ڕاهاتبێ
بۆنێک بەسەر سەداماندا دەدات
دەنگی نووساو..
هیچ لە ئارکیۆلۆژیای تەمەن و
سەدای بینین نازانێ..
لەگەڵ شوێندا پێکدا دەدەن
لەگەڵ ئەوەشدا دان بەشکستیان ناهێنن



دارستانێک .. دووان .. سێ
لەگەڵ دەوروبەری خۆمدا دەدوێم
لەوە بەدەر شک نابەم
بۆ مەملەکەتی خۆشەویستی و دەروشانەوە بگەڕێمەوە
چونکە دەنگی نووساو
لە تامەزرۆیی شەقامە تاریکە ساختەکاندا تواونەتەوە
تەنها ئەمەم بەدەست ماوە پێیان بڵێم
کە هەر ئەوەش باوەڕی منە
(ئێوە کوردستانی خۆتان
منیش کوردستانی خۆم..)

**2006/3/8**

**(110)**

دەشێ ئەم بانێژەیە
بانیژەی خوا حافیزی بێ
یاخود دەست ڕاوەشاندنی
خوا حافیزی بێت بەسەر بانیژەیەکەوە
بە بێدەنگی خۆمان هەڵمان ناو
بەشنەی با نەخشاندمان
کە چەندێکیانمان لە ڕەنگی سپێدەوە دزی و



هەندێکی دیکەش لە چرپەی شەوگار
زۆرجار بە وڕێنەیەک دەچوو
کەس لای لێ نەدەکردەوە
سۆزێک لە سنگەوە دەردەچێ
وەفای تێچووە
ئەو بوونەوەرە نامۆیە
یا گوڵێک لە جیاتی چرا
لە وێستگە خەمبارەکان هەڵیدەواسم
قەت ڕۆژێک ڕوانینی ڕێبوارانم
بەلاوە گرنگ نەبووە..

ئەوە وەسوەسەی من بووە...
وەسوەسەی مرۆڤێک
کە بۆ وەجد و نوور
ژیاوەو دەژی
بەم جۆرە دووبانکەکەم جێ دێڵم و
پەردە دادەدەمەوە
مانگ و ئەستێرانیش
بۆ ئەوانە بە جێدێڵم
گۆرانیان بۆ دەڵێن...

**2006/6/21**